گەشەپێدان






# نهێنی
# قسەکردن

نووسینی
د. ئیهاب فکری

وەرگێرانی
دەشنێ تاڵیب شوانی

بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند:
زامدار قادری
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە:
ئەیاد نادر




Sarwar Rzgar Marf

هەولێر _ تەنیشت پارێزگا_ بازاری ڕۆشنبیری
nawandi.raha@gmail.com
07504066674
raha ڕەها

9/11/2020
(یەکشەممە)

# ئەتەکێتی قسەکردن

نووسینی

د. ئیهاب فکری

وەرگێڕانی

دەشنێ تاڵیب شوانی

چاپی یەکەم
٢٠٢٠






لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ( ڕەها ) بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب ١٦

  

**ناوی کتێب: ئەتەکێتی قسەکردن**

**نووسینی: د. ئیهاب فکری**

**وەرگێڕانی: دەشنێ تاڵیب شوانی**

**دیزاینی بەرگ: ئەحمەد عبدالله هەرتەلی**

**دیزاینی ناوەوە: ئەیاد نادر**

**هەڵەچنی: ناوەندی ڕەها**

**چاپ: یەکەم (٢٠٢٠)**

**تیراژ: (١٠٠٠) دانە**

  

هەرێمی کوردستان - عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
هۆبەی سپاردنی کتێب



إقليم كوردستان - العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة الثقافة والشباب
المديرية العامة للمكتبات العامة
شعبة ايداع الكتب

Kurdistan Regional - Iraq / Council of Ministers
Ministry of Culture & Youth - G.D. of Public Libraries

ژمارە: ٢٠١
بەروار: / / کوردی
العدد:
التاريخ:

بۆ/ چاپخانەی دەردەوەی هەرێم

ب/ ژمارەی سپاردن

بەپێی یاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٣
ژمارەی سپاردن درا بەکتێبی (ئەتەکێتی قسەکردن) لە وەرگێڕانی (دەهێنی ئالیب شوانی) بە تیراژی (١٠٠٠) دانە بە لاوەڕۆکی ( گەشەپێدان) لە چاپخانەکەتان چاپ بکرێت بەمەرجێک (٥) دانە بۆبەشی سپاردن رەوانە بکەن

لەگەڵ رێزماندا...

| ١١٦ | ژمارەی سپاردن |
| --- | --- |
| ٢٠٢٠ | ساڵ |

تێبینی:
١- [illegible]
٢- هەر چاپخانەیەک پابەند نەبێت بە [illegible] ژمارەی سپاردنی [illegible]

سەرباز جەوهەر محەمەد
ب/بەڕێوەبەری گشتی کتێبخانە گشتییەکان

وێنەیەک بۆ:
[illegible]

library.kurdistan@yahoo.com
Iraq - KRG - Erbil - Behind MOCY
هەرێمی کوردستانی عێراق - هەولێر - [illegible]
إقليم كوردستان العراق - أربيل - [illegible] - خلف وزارة الثقافة و الشباب

# پێشەکی

کچەکە وتی: باوکە مۆبایلم دەوێت...

باوک: نەخێر

کچ: تەنها داوای ئەوەندە دەکەم تۆش دەڵێی نەخێر...

باوک: بەڵێ.

کچ: جارێکی دیکە لەم ماڵە داوای هیچ شتێک ناکەم...

باوک: باشتر.

❊❊❊❊

وتووێژێکی ئاسایی و ئەنجامێکی ئاسایی... شکستخواردوو

کچەکە لەوپەڕی لای ڕاستەوە دەست پێدەکات.. هەموو ئەوەی هیواخوازێتی..(مۆبایلە)، ئەگەرچی دڵنیایە کە باوکی ڕازی نابێت، بەڵام دەڵێت کە مۆبایلی دەوێت، باوکەکەش لەوپەڕی لای چەپ.. زۆر بەتوندی وەڵام دەداتەوە.. وەڵامەکەشی ئەوەیە کە بەهیچ جۆرێ مۆبایلی بۆ ناکڕێ گەرچی باوکەکە دەزانێت ئەوە کچەکەی زۆر بێزار دەکات، بەڵام هەر دەڵێت " نەخێر"..

ئەمە وتووێژە توندووتیژەکانە!

ئەوپەڕی لای ڕاست و چەپ، تاوەکو وای لێ دێت هیوا و تێگەشتن لەو ماڵەدا لەناو دەچێت ، و نرخی وتووێژ نامێنێت، چونکە ئەنجامی ویستراو بەدی نایەت، بەوجۆرەش خێزانەکە وەک هەر خێزانکی تریان بەسەر دێت.. خێزانێکی سارد لەگەڵ یەکدی تەنانەت لە گەرمای هاوینیشدا!!

کێشەکەش ئەمەیە..

هونەری قسەکردن!

لەم کتێبەدا چوار دەرگای سەرەکی هەن لەبارەی هونەری ئاخاوتنەوە:

**١- هونەری گوێگرتن.**
**٢- پچڕاندنی قسەکار.**
**٣- جیاوازی نێوان مشتومڕ لەگەڵ وتووێژ.**
**٤- دڵنیابوونی کەسی.**

گفتگۆردن دەربارەی هونەری ئاخاوتن دەمانبات بەرەو بابەت و خاڵی زیاتر، بەڵام من پێم باشتربوو کە تەنها لەبارەی بابەتە گرنگەکانی هەونەری ئاخاوتنەوە بدوێم. بۆ ئەوەی زۆر درێژەی پێنەدەم، چونکە خوێنەر بەگشتی ڕەنگە حەزی پێنەکات؛ یاخود حەز بە بابەتە سادەکان بکات وەک لەوانەی وشەی قورس و واتای فەلسەفین..

هەروەها لەم کتێبەدا حەوت وێستگەمان بەرچاو دەکەوێ بێجگە لە چوار دەرگا سەرەکییەکەی هونەری ئاخاوتن. ئەم وێستاگانەش گرنگترین ئەو هەڵوێست و بارودۆخە تایبەتییانە دەخاتەڕوو کە دەبێت بەتوندی ڕەچاوبکرێت و گرنگی پێ بدرێت لەلایەن ئەوانەی کە هونەری ئاخاوتنیان پێ گرنگە.

بەم شێوەیە لەدوای ڕەزامەندی خوای گەورە، ئامانجمە کە سەرەنجی خوێنەر ڕابکێشم بۆ نرخی ئەو وشانەی کە دەریان دەبڕێت. تیشک خستنە سەر ئەو خاڵەی کە وشەکان کاریگەری زۆریان هەیە لەسەر ئەو کەسانەی کە لەگەڵیان دەدوێین، وە بەردەوامی ژیان و سەرکەوتن بەسەر بەرهەڵستییەکان لەهەموو ڕویەکەوە. داواکارم لەخوای گەورە کە ئەم کتێبە بکاتە هۆکارێک بۆ ئەوەی گرنگی بە نرخی وتەکان بدرێت، ئەگەرچی زۆربەی کات وشەکان کاریگەرییان لەدەستداوە، وتەکان شکۆیان نەماوە، بیروبۆچونەکان چیتر زیندانیکراوی سینە و ئەقڵەکانن، وە بیروبۆچوونی ئەوانی تر ئیدی قەبوڵ ناکرێن.. پشت بەخوای گەورە.

د. ئیهاب فکری

# سودی هونەری ئاخاوتن چییە؟

چییە؟

خێردار نییە؟

نەخۆشێک چوو بۆ لای دکتۆرێک بۆ پشکنین، دوای چاوەڕوانییەکی زۆر لەدەرەوەی ژووری پشکنینەکە لەوپەڕی نا ئارامیدا چاوەڕوانە گوێبیستی پەرستیارەکەیە ناوی بێنێ تا بچێتە ژوورەوە بۆلای دکتۆر. لەدڵی خۆیدا دەپرسێ ئاخۆ من چیمە؟ دەبێ ئەنجامەکەی چی بێت؟ خوایە بمپارێزە، بەویستی خوا باش دەبێت، ئێستا دکتۆر دڵنیام دەکاتەوە... دەچێتەوە ژوورەوە بۆ لای دکتۆر، دوای ئەوەی پشکنینی بۆ دەکات گفتوگۆی نێوانیان بەم جۆرە دەبێت:

- نەخۆش: دکتۆر ئەنجامی پشکنینەکە باشە؟

- دکتۆر: بەردەوام دەبێت لە نووسینی دەرمانەکان و هیچ ناڵێت!!

- نەخۆش: دکتۆر ان شاء الله هەموو شتێ باشە؟

- دکتۆر: دەنوسێ و سەیری نەخۆشەکە ناکات.

نەخۆشەکە خۆی دڵخۆش دەردەخات و قەلەقییەکەی دەشارێتەوە: چییە دکتۆر؟.. خێردار نییە یان چی؟

- دکتۆر ڕەچەتەکەی پێدەدات و سەیری ناکات: لەسەر ئەم دەرمانانە بەردەوامبە تاوەکو لە هەفتەی داهاتوو چاوم پێت دەکەوێتەوە".

- نەخۆش: "واتا من چ نەخۆشییەکمە دکتۆر؟"

دکتۆرەکە بە بێزارییەوە پێکەنی: "گرنگترین شت ئەوەیە لەسەر ئەم دەرمانەنە بەردەوامبیت، تاوەکو ئەوکاتەی چاوم پێت دەکەوێتەوە.. خوات لەگەڵ بێت"!!

نەخۆشەکە دێتە دەرەوە، لەمێشکیدا هەزار بیرۆکە هەیە، " دیارە بابەتەکە زۆر گەورەیە، ئەی باشە منداڵەکانم، کارەکەم، ماڵەکەم چی بەسەردێ؟ باشە خۆ من بیرم چوو لێی بپرسم ئایا بارودۆخەکەم پێویستی بەوەیە مۆڵەت لە کارەکەم وەرگرم؟ بگەڕێمەوە؟ تازە بۆکوێ بگەڕێمەوە؟ دەبێ دووبارە سەرە بگرمەوە، لەبنەڕەتدا هەر بەزۆر قسەم لەگەڵ دەکات، خوایە داوای پارێزگاریت لێدەکەم" دەگەڕێتەوە ماڵ و خەمی دنیا لەسەر شانییەتی!

كێشەكە ئەوەیە، هیچ كێشەیەك بوونی نییە، تەنها كەمێك سەرمای بووە، دكتۆر پێی وایە نەخۆشییەكە شایەنی باسكردنیش نییە، سوكە سەرمایەكە، بەڵام نەخۆشەكە پێی وایە بابەتەكە ئەوەندە گەورەیە دكتۆركە ناتوانێ بیڵێت، بەو جۆرە نەخۆشەكە ئازار دەچێژێت، ڕەنگە دڵەڕاوكێیەكەی ئەوەندە زیاد بكات كە بەڕاستی نەخۆشی بخات، تەنانەت ئەگەر نەخۆشیش نەكەوێت ئاخۆ دەبێ چ شەوێكی بەڕێ كردبێ كاتێك بیری لە ژیان كردۆتەوە تێیدا مابێت. هەموو ئەمانە بەهۆی ئەوەوەیە كە دكتۆرەكە لایەنی پیشەیی خۆی بەتەواوی جێبەجێكردووە لەڕووی پشكنینەوە، وەك ئەوەی سەیارەیەكی پشكنیبێت، بەڵام گرنگی نەداوە كە وشەكانی كاریگەرییان لەسەر نەخۆشەكە هەیە، چونكە ئەوەش بەشێكی پێویستە و ئەركی سەرشانیەتی، مافی نەخۆشەكەشە.

هەر لەبەر ئەوەیە باسی هونەری ئاخاوتن دەكەین..

***

## ئاخۆ ڤۆمیتینگی هەیە؟

ڕەنگە چاوت بە هەندێ دکتۆر کەوتبێ کە حەزدەکەن بە شێوەیەکی دووردودرێژ باسی نەخۆشییەکە بکەن، بەڵام بە بەکارهێنانی وشەی ئینگلیزی زانستی، نەخۆشەکەش لەهیچ تێناگات; ڕەنگە نەخۆشەکە دەرچووی خوێندنگەیەکی حکومی بێت  کە لە زمانی ئینگلیزی تێناگات، یاخود ڕەنگە هەر هیچ خوێنەواری نەبێت وەک زۆربەی نەوەکانی وڵاتەکەی من. جا دکتۆرەکە چی وتوە بە بادا چووە. چونکە ئەو دەستەواژە زانستییانەی کە  دکتۆرەکە بەکاری هێناوە نەخۆشەکە تێی ناگات. هیچ پێویست بەوە ناکات دکتۆرکە بەو شێوەیە ڕوونکردنەوە بدات تاوەکو لێهاتووی خۆی دەربخات لەبەرامبەر نەخۆشەکە. ئەگەر چی بەداخەوە هەندێ کات شتی لەو جۆرە ڕوودەدات، دکتۆرەکە بەهۆی زۆر بەکارهێنانی ئەو دەستەواژە ئینگلیزییانە بیری دەچێتەوە کە ڕەنگە نەخۆشە لەم دەستەواژانە تێنەگات:

- دکتۆرەکە لەکاتی پشکنیندا بە نەخۆشەکە دەڵێت ئایا ڤۆمیتینگی (vomiting) هەیە؟

- نەخۆشەکە شەرم دەکات و دەڵێت: نەخێر.. ئاساییم.

- دکتۆرەکەش دەرمانەکان دەنوسێ و دەڵێت: کەواتە زۆر باشە

لێرە دکتۆرەکە دەپرسێت ئاخۆ نەخۆشەکە هیچ تووشی ڕشانەوە بووە؟، نەخۆشەکەش دەڵێت نەخێر. ئەگەرچی لەو ڕۆژەدا دووجار وای لێهاتووە. بەڵام بەهۆی ئەوەی کە بەشێوەیەکی ناڕاست دکتۆرەکە پرسیارەکەی کردووە بۆیە نەخۆشەکەش وەڵامی داوەتەوە و بەمەش ئەنجامی پشکنینەکە هەڵە دەبێت.... لاحول ولا قوة الا بالله!

لەبەر ئەمەیە باسی هونەری ئاخاوتن دەکەین..

❋❋❋

# خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوە!!

زۆر ڕاهێنانمان پێكراوە لە خوێندنگە، پەیمانگا، زانكۆكان دەربارەی چۆنیەتی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی كە ئاڕاستەمان دەكرێت، جا ئەگەر پرسیارەكان بەشێوەی زارەكی بن یان لەسەر كاغەز، هەر مامۆستایەو ڕێگەیەكی خۆی هەیە بۆ گەیاندنی زانستەكەی ( وكل شیخ له طریقة كما یقول المثل)، هەیانە بە خوێندكارەكە دەڵێت: گرنگترین شت پڕكرنەوەی كاغەزی وەڵامە بە شێوەیەكی ڕێك و پێك. هەندێكی تر جەخت دەكەنەوە لەسەر دەستخەت جوانی، هەندێكی تریان دەڵێن: گرنگترین شت لە تاقیكردنەوەی زارەكی ئەوەی كە ڕەوشتت جوان بێت، نەوەك دانیشی بكەویتە فەلسەفە لێدان،..هتد

هەموو ئەم ڕێنمونییانە دروست بن یان نا، بەجێ بن یان نا، هەموویان باس لە چۆنیەتی وەڵامدانەوەی پرسیار دەكەن، بەڵام ئەی پرسیارەكە لەكوێیە؟!

ئەی كوا فێربوونی هونەری پرسیاركردن؟

پرسیاری دروست نیوەی وەڵامە هەروەك زاناكان دەڵێن، ئێمە زۆرمان خوێندووە دەربارەی چۆنیەتی وەڵامدانەوە، لەناوەندییەكان نموونەی زۆر خراپمان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا فێرنەكراوین چۆن پرسیار بكەین، گەر بزانی چۆن پرسیار

دەكەی ئەمە بۆخۆی زانستێكە، كوا ئەم زانستە لەكوێی خوێندنگەو زانكۆكانماندا هەیە؟ كوا گرنگی هونەری پرسیاركردن جیا لە هونەری قسەكردن بەگشتی؟

بۆنموونە دەبینی كەسێك لێت دەپرسێ: بارودۆخەكە چۆن بەڕێوەدەچێت؟

(پرسیارێكی زۆر سادەیە، ڕەنگە ئەو كەسەی پرسیارەكەشی كردووە بەگشتی مەبەستی حاڵ و ئەحواڵ پرسین بووبێت؛ ویستبێتی بپرسێت بارودۆخت چۆنە؟. پرسیارێكی زۆر ئاسایی دەكرێت مەبەست لێی تەنها بۆ خۆشی بێت و هیچی تر، بەڵام ئەو كەسەی كە پرسیاری لێ دەكرێ ڕەنگە بیری بۆ شتێكی دیكە بچێت، ڕەنگە وا بزانێ ئەو كەسەی پرسیارەكەی كردووە مەبەستی ئاسایش و بەڕێوەبردنی وڵات بێت، هەركەسەو ڕەنگە بە شێوەیەك لێكی بداتەوە!!)

بەم شێوەیە ڕوانگەی جیاواز دروست دەبێت، گفتوگۆكان بە ئاڕاستەی سەیر و سەمەرەدا دەڕۆن هەروەك چۆن لە هەندێ دیمەنی فیلمە كۆمیدییەكان ڕوودەدات، دەبینین كارەكتەری سەرەكی باسی سەیارەیەكی دیاری كراو دەكات بۆ هاوسێكەی: " بینیت؟ ئەو هەموو جوانییەت بینی؟ سەرسامت دەكات، بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە، دوێنێ كە بینیم لە سەر شەقامەكە

خەریک بوو ماچی بکەم..." کەچی هاوسێکەی پێی وایە باسی کچی هاوسێکەی تریان دەکات. ئەوەی کە ئەو دەیەوێت بچێتە داخوازی لەنزیکترین کاتدا، ئەمەش بۆ گەرمکردنی دیمەنەکە تاوەکو وا لە بینەرەکان بکەن پێبکەنن. بەڵام لە ڕاستدا ئەم هەڵوێستە زۆربەی کات بە پێکەنین کۆتای نایات، بەڵکو ڕەنگە بە لەدەستدانی هاوڕێیان و لێک جیابوونەوەی هاوسەرەکان و دەرکردنی کارمەندەکان و شەڕ و پێکدادانی سەر شەقامەکان کۆتای بێت.

بەڵام کێشە سەرەکییەکە دەستنیشان نەکردنی پرسیارەکەیە بە دیاری کراوی.

زۆر کات بەرچاومان دەکەوێت ئەوکەسەی پرسیاری هەیە نازانێ چۆن پرسیارەکەی بکات، ئەمەش شتێکی زۆر ئاساییە، چونکە فێرنەکراوە چۆن پرسیارەکەی دابڕێژێت. بازرگانێکی کارامەی ئۆتۆمبێلە و دەیەوێت لە مامۆستایەکی شارەزای فەتوا پرسیار بکات، هەلێکی بۆ ڕێککەوتوە و ڕووبەڕوو چاوی پێی کەوتووە چونکە ماوەیەکی زۆرە دەیەوێت پرسیاری لێ بکات " ئاخۆ کارپێکردن بە قیست حەڵاڵە یان حەرامە؟"، پرسیارێکی زۆر بڵاوە لەناو خەڵکی بەگشتی، بەڵام ئەم بازرگانە ڕانەهاتووە پرسیارەکانی دابڕێژت، هیچ کام لە شێوازەکانی قاڵبی

پرسیاکردن نازانێ کە پێکدێت لە: پێشەکی، خستنەڕووی کێشەکە، لەکۆتاییدا دووبارە دارشتنەوەی پرسیارەکە بە شێوەیەکی سادەتر و بە بەکارهێنانی دەستەواژەی ئاسانتر..)

ئەو ئەم وردەکارییانە نازانێت بۆیە تێیدا دەمێنێت، نازانێت چۆن پرسیارەکەی بکات، کاتێک لەبارەی پرسیارەکەی دەدوێت وەک ئەوەیە هیچ پرسیارێکی نەکردبێت..

بە مامۆستا ئاینییەکە دەڵێت: بەڕێزەکەم، من پرسیارێکم هەبوو، پرسیارێکە؟ نازانم ئاخۆ ڕاستە یان هەڵە؟ یانی بۆ نموونە من ئەگەر بازرگانی ئۆتۆمبێل بم، بۆ نموونە، یان شتێ لەو بابەتە، چۆن کڕین و فرۆشتن بکەین بەڕای بەڕێزتان؟ بۆ نموونە کڕیارەکە حەزنەکات بە کاش پارەکە بدات، نرخەکەشی زۆرە، ئەی دەبێت چی بکرێت؟ ئەی چی دەڵێن لەبارەی بەقیست فرۆشتن؟ شتێ لەو بابەتە... خوای گەورە پاداشتتان بداتەوە!!

سەرەڕای شارەزاییە فراوانەکەی مامۆستا ئایینییەکە لە فەتوادان دەربارەی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم جۆرە پرسیارانە، بەڵام ئەگەر تووشی بەهەڵەچووندا بێت سەرزەنشت ناکرێ لە وەڵامدانەی ئەم جۆرە پرسیارە سەرسوڕهێنەرانە، ڕەنگە مەلاکە دەست بکات بە شیکردنەوەی وردی کڕین و فرۆشتن

لەسەرەتاوە، ئەگەرچی ئەو کەسەی پرسیارەکەی کردووە پێویستی بەو شیکردنەوەیە نییە، ئەو تەنها دەیەوێت بزانێت ئایا بەقیست کڕین و فرۆشتن حەڵاڵە یان حەرام؟ بازرگانەکە لای خۆی پێی وایە کە پرسیارێکی دیاریکراوی کردووە، بۆیە دەبێت وەڵامەکەشی گشتگیر نەبێت و تەنها وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، ڕەنگە پێشی وابێت مامۆستاکە پێچ و پەنای پێدەکات، لێرەوە گریمانەی پلاندان سەرهەڵدەدات.. " حکومەت ئاگاداری مامۆستای کردۆتەوە کە وەڵامی ئەو پرسیارانە نەداتەوە" لێرەوە متمانە کەم دەبێتەوە، چیرۆک و شیکردنەوە سەرهەڵدەدات، هۆکاریش ئەم پرسیارە نامۆیەیە کە بەرهەمەکەی وەڵامێکی گشتگیری بەدوای خۆیدا هێناوە، بۆ خەڵکی ئاسایی نابێت.

هەر لەبەر ئەوەشە باسی هونەری قسەکردن دەکەین..

❊❊❊

بەکورتی:

گرنگی نەدان بە وتەکان زۆربەی کات دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەی زۆر، دەرچووانی قوتابخانەو زانکۆ حوکومی و ئەهلییەکان لە میسر دەبوا ئامادە بکرێن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ژیانی کرداری، بەڵام بەداخەوە تەنها لەڕووی پیشەییەوە ئامادە دەکرێن، ئەو پرۆگرام و وانانەی دەوترێنەوە، و

تاقیکردنەوەکانیش هەموو تەنها بۆ ئەوەیە نازناوێکی پیشەییان پێبدرێت جا ئەگەر پیشەی ژمێریاری، پیشەی دکتۆری، ئەندازیاری، یان دەرمانساز ..هتد بێت. هەرپیشەیەک بێت تەنانەت ئەگەر لەکارگەیەکیش کار بکات، پێویستە توانای مامەڵەکردن وگفتوگۆکردنی هەبێت لەگەڵ کارگوزارەکانی دیکە، هاوکارەکانی، نەخۆش، بەڕێوەبەر، هاوڕێکانی، هەموو خەڵکی دیکە، جا ئەم مامەڵەکردنە لەڕێگەی قسەکردنی ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕوو بێت یان لەڕێگەی نامەی نوسراو بەدەست یان لەڕێگەی کۆمپیوتەرەوە بێت..

هەر بۆیە قسەکردن لەبارەی چۆنیەتی گفتوگۆکردن تەنها بۆ خۆشی یان بۆ بەدەستهێنانی ڕۆشنبیرییەکی گشتی نییە، بەڵکو پێویستییەکی سەرەکی مرۆڤە بۆ سەرکەوتنی لەژیان، بەڵکو ئەوە شتێکی بنەڕەتییە بۆ سەرکەوتن و بەرەو پێش چوونی هەر کۆمەڵگەیەک.

ڕەنگە هەندێ کەس لایان سەیربێت ئەگەر بزانن یەکەم هونەری قسەکردن بریتییە لە قسەنەکردن، ئەوەش ئەو بابەتەیە کە لە دەرگای دووەم باسی لێودەکەین.. ڕەنگە ناوی لێ بنێین (هونەری گوێگرتن)!

# هونەری گوێگرتن

## ( "گێلێکی بێدەنگ بە دانا دادەنرێت")

وتەیەکی جوانە لە تەوراتدا باسی لێوەکراوە، لەبەشی (سفر الامثال)، لە زمانی حەزرەتی سولەیمانەوە وەرگیراوە ( سەلامی خوای لێبێت).

باشە ئەگەر کەسێکی نەزان و گێل لای زاناکانەوە دانیشێت بەبێ دەنگی زیانی چییە ؟ بەپێچەوانەوە زۆر دانیشتنی لەگەڵ کەسە داناکاندا دەریدەکات لە بازنەی نەزانی، چونکە گوێ دەگرێت و بێدەگ دەبێت و زانست و شارەزایی زیاتر دەبێت...

کاتێک چاودێری کەسە کورتبین و ئەقڵ داخراوەکان دەکەیت، ئەگەر چی هەندێکیان کەمێک لێهاتوییان هەیە بەبۆنەی تەمەن یان جۆری کارەکەیانەوە، بەڵام بۆت دەردەکەوێت کە هەموویان خاڵێکی هاوبەشییان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە زۆرتر قسەدەکەن لەوەی کە گوێ دەگرن...

دەبینی یەکێک لەوانە بیروبۆچونێکی زۆر توندی هەیە لەبارەی هەر بابەتێکەوە کە لەدەوروبەری باسی لێوەدەکەن، یان زۆر لە نرخی بابەتێک کەم دەکاتەوە کە بۆی نوێ بێت ، جا بابەتەکە هەرچییەک بێت چۆن دەکرێ ئەو خۆی نەکاتە ناوییەوە،

تەنانەت ئەگەر بابەتەکە پەیوەندی بە بارودۆخی گەل و شۆڕشی داهاتووی تەکنەلۆجیاوە هەبێت، یان گۆڕانی ئابووری جیهان کە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ژیانی ئەو دەبێت، گرنگ نییە بابەتەکە هەرچییەک بێت، تەنها ئەو دەبێت قسە بکات هەتا کۆتایی دانیشتنەکە، یان تاوەکو کۆتای تەمەنی، تاوەکو کۆتا هەناسەی، هەڵگری دروشمی " من قسەدەکەم کەواتە من بوونم هەیە" .. کێشەکە ئەوەیە نازانێ ئەم دروشمە ڕەنگە وابکات تێڕوانینی خەڵکی بۆی بریتی بێت لە : ئەو زۆر قسە دەکات، کەواتە من لێرە نابم.

خەڵکی لەگەڵ تێپەڕبوونی کات بۆی دەردەکەوێت گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەم کەسە تووشی ناڕەحەتی دەکات، پێڵوەکان دادەخرێن و چاوەکان خەو دەیان باتەوە، بۆئەوەی کاتیان بەفیڕۆ نەچێ و سەلامەتی بیکردنەوەیان بپارێزن هەڵدێن بۆ شوێنێکی دیکە، لەکاتێکدا ئەو هەر خەریکی قسەکردنە تاوەکو کۆتا هەناسەی، تا کۆتا سەرباز هەبێ گوێی لێبگرێت.

دووجۆر بێدەنگی هەیە: ئەرێنی و نەرێنی.

---

بێدەنگی ئەرێنی خوازراوە، ئەو بێدەنگییە هەل دەبەخشێت بە خاوەنەکەی تاوەکو گوێبگرێت لەو کەسەی قسەی بۆ دەکات،

یان ئەو جۆرە بێدەنگییەکە وادەکات خاوەنەکەی بیربکاتەوە و تێڕابمێنێ و لێهاتووی بەدەستبهێنێ..

بەڵام، لەبەرامبەردا جۆرێکی دیکەی بێدەنگیمان بەرچاو دەکەوێ زۆربەی کات بەرهەمی خۆ بەکەمزانینی خاوەنەکەیەتی، کەسەکە هیچ ناڵێت لەترسی ئەوەی هێرش نەکرێتە سەری، یاخود ڕەنگە لە ئەنجامی خۆپاریزی بێت نەوەک شتێکی ڕێگەپێنەدراو بڵێت و ئەوانی دیکە گاڵتەی پێبکەن.. ئەم جۆرە بێدەنگییە نەرێنییە زیانی زیاترە لە سوود.

دەگێڕنەوە "نجیب محفوظ" هەندێ کات شێوازێکی تایبەتی بێدەنگی نەرێنێ بەکارهێناوە - خوا لێی ڕازی بێت ئەگەر قسەکانی کەسێکی بەدڵ نەبووایە سەماعە تایبەتییەکەی دادەخست، لەو کاتەدا بەیارمەتی ئەو ئامێرەوە نەبووایە نەیدەتوانی هیچ ببیستی، هەربۆیە وا خۆی نیشانداوە گوێی لێ دەگرێت لە کاتێکدا گوێی لەهیچ نەبووە کە کەسەکە وتوویەتی، مامۆستا سەماعەکەی کوژاندوەتەوە لەکاتێکدا لەگەڵ کەسەکەدا دانیشتووە، ئەمە بۆ کەسێکی وەکو جیب محفوظ کە لێهاتویی و ڕۆشنبیرییەکی فراوانی هەبووە، و ئارامگرییەکی دیاری کراوی هەبووە بەهۆی چوونە تەمەن و نەخۆشییەوە ڕەنگە شتێکی ڕێگە پێدراوبێت، بەڵام بۆ ئەوانەی لە سەرەتای

گەنجیدان ڕێگە پێدراو نییە، چونكە ئەوان لەقۆناغی پێكهێنانی شارەزایی و گەشەسەندن دان.

## ئەی پیاو قسەبکە تاوەکو شارەزات ببم

## چۆن بتناسم لەکاتێک ئەوەی لەناختدایە دەری ناخەیت

ئەمە بانگەشە نییە بۆ زۆر قسەکردن، ناونیشانی ئەم دەرگایە هانی بێدەنگبوونی زیرەکانە دەدات لەگەڵ " هونەری گوێگرتن"، بەڵام مەبەستیش لێی وازهێنانی یەکجاری نیە لە قسەکردن..

(ئەو کەسەی زۆر قسە دەکات کەس هیچی لێ تێناگات، چونکە ئەوەندە قسەی کردووە کەسی بەرامبەر هیچی بیر نامێنێت. لەلایەکی دیکەشەوە جەخت دەکەینەوە کە بێدەنگی زۆربەی کات ئاماژە نییە بۆ بیکردنەوە و تێڕامان و باش گوێگرتن، بەڵکو بێدەنگی بەردەوام ئاماژەیە بۆ ئاڵۆزی و دابڕان و کەمی متمانە بەخۆبوون.)

باشترین وتەکان ئەوانەن کەم و پڕ واتان، باشترین کارەکانیش نێوەندگیرییە، یانی نە بەدرێژایی کات قسە بکە نە هەمیشە بێدەنگیش بە.. بە دوور و درێژی قسە مەکە ئەوانی دیکە بێزار بکەیت..

(کاتێک دەدوێین پێویستە قسەکەمان واتای هەبێت، کاتێکیش بێدەنگ دەبین دەبێت بێدەنگیشمان واتاداربێت..) پێشینانیش وتویانە: بکڕە، مەفرۆشە. لێرەدا ئاماژە بەوە دەکات سەرەتا

گوێگرتن لەوانی دیکە پێویستە، دواتر بە ئاڕاستەیەکی دروست دەست بە قسەکردن بکە.. چونکە هەندێ کەس تەنها بۆ ئەوەی بەشداری بکەن قسەدەکەن، تاوەکو ئەوانی تر پێی نەڵێن هیچ بیروبۆچوونێکی نییە. هەر بۆیە کاتێک کۆمەڵێک لەبارەی بابەتێکەوە گفتوگۆ دەکەن دوورە لە شارەزایی ئەو، تەنها بۆ ئەوەی قسەیەک بکات و بیروڕای خۆی دەرببڕێ، چاوەڕێ دەکات وشەیەک بڵێن ئەویش زانیارییەکی کەمی لەبارەوە هەبێت، کاتێک گوێبیستی ئەو وشەیە دەبێت وەک ئەوە وایە گوێبیستی تەقەی دەستپێکردنی پێشبڕکێیەکی سەد کەسی بووبێت و ئەویش دەست دەکات بە قسەکردن لەو وشەیەوە. ئەگەر چی ناشزانێ ئەو وشەیە تەنها وەکو نموونەیەک هێنراوەتەوە و هیچ پەیوەندی بەو باسەوە نییە کە کۆمەڵە کەسەکە لەسەری دواون و بۆ ئەو مەبەستەی ئەو تێی گەشتووە بەکارییان نەهێناوە..

بۆنموونە:

کۆمەڵە کەسێک باسی فەلسەفەی بوون دەکەن..دەڵێن دەکرێ مرۆڤ بوونی هەبێ لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی بیروباوەڕ تەندروست بێت، کەسی واش هەیە دژی ئەم بیروڕایەیە بۆیە

دەڵێت ئەوە شتێکی ئەستەمە، لێرەدا پێکدادانی نێوان دوو ئاڕاستەی پێچەوانەی یەک ڕوودەدات!!

وتەیەکی، فەسەفەییە، پێویستیش نییە هەموو کەس لێی تێبگات، بەڵکو هیچ پێویست نییە کە ئەم قسانە هیچ واتایەکیان هەبێت. زۆربەی گفتوگۆ فەلسەفییەکان هیچ ئەنجامێکی سەر لێدەرچووی لێ پەیدا نابێت، چونکە فەلسەفە هەوڵە بۆ گەیشتن بەڕاستی، ڕاستیش شتیک نییە بە ئاسانی بەدەست بێت.

بەڵام یەکێک لەو هاوڕێیانەمان کە بەهەرشێوەیەک بێت دەیانەوێ قسەبکەن لەو کۆڕە فەلسەفییەدا دانیشتوون، هیچیش تێناگات لەوانەی ئەوان باسی لێوەدەکەن. ئەگەر قسەیەک نەکات زۆر بۆی ئەستەمە ، زۆر ئەستەمە دانیشێت و گوێبگرێت، هەربۆیە کاتێک بەشێکی قسەکانی گفتوگۆکە بەم شێوەیە دەبێت:

یەکێک دەڵێت: من وای بۆ دەچم کە باشتر بێت لە دژی نەبیت، چونکە دەکرێت مرۆڤ هەم بوونی هەبێت وهەمیش پەیوەستی ئایین بێت، بیرۆکەی بوون پێچەوانەی هیچ بیروباوڕێکی ئایین نییە، بەڵکو هەردووکیان بەهەمان ئاڕاستە و هاوسەنگی تاوەکو کۆتایی بەدەوام دەبن.

یەکێکی تر لە دانیشتنەکەدا دەڵێت: چۆن شتی وا دەبێت؟ لە بنەڕەتدا فەلسەفەی بوون دژی بیروباوەڕە جێگیرەکانە، ئایینیش لەبنەڕەتدا لە شتە بەدیهی و دامەزراوەکان پێکهاتووە.

ئەو هاوڕێیەشمان کە زۆر حەزی لەقسەیە و زۆر بۆی ئەستەمە قسە نەکات دەست پێدەکات و دەڵێت: ئای لەم کارەساتە چۆن دەکرێ لەهیچ تێنەگەی؟ خۆ ئەوە چی تێدایە؟ بەردەوام دەبێت لە قسەکردن و نموونە هێنانەوە تاوەکو بۆچوونی خۆی بخاتەڕوو و دەڵێت: چۆن دەکرێ کەسێک گوێ لە مۆزارت و بیتهۆفن بگرێت لەهەمان کاتیش سەما بکات لەگەڵ گۆرانیەکانی عەمر و دیاب کە لە سەری خۆیدا گوێ بیستێتی؟

لە دڵی خۆیدا دەڵێت: چانسی ژیانمە، لەکۆتیدا دەتوانم قسە بکەم. دەست بەقسە دەکات بە دەنگێکی بیستراوی ڕوون "هەر بەو بۆنەیەوە بەڕای من ئێستا لەو گۆڕەپاندا زۆر کەسی باشتر لە عەمر و دیاب هەن، پێم وایە کە هیچ شتێک بوونی نییە بەناوی گۆرانی گەنجانە، گەنجی لە دڵدایە نەوەک لە گۆرانی و مۆسیقا و قسەی بێ مانای لەو جۆرانە، ئەی ئێوە دەڵێن چی؟"

بێدەنگییەكی ترسناك باڵدەكێشێ بەسەر هەمووان و كەس هیچ ناڵێت، هەمووان سەیری یەكدی دەكەن زمان حاڵانە دەپرسن ئاخۆ ئەمە كێیە؟

خۆزگە هیچی نەوتایە و بێدەنگ بوایە، دەیتوانی بە بێدەنگی دابنیشێت یان پرسیاری بكردایە واتای بوون چییە؟ پرسیاركردن هیچ شەرمەزاری نییە. پێویستیش نییە هەموو شتێك بزانین، كاتێك زانیاریمان لەبارەی شتێكەوە نەبوو واتای ئەوە نییە بەتەواوی نەزان بین. هەروەها بوونی زانیاری لەبارەی شتێكەوە واتای ئەوە نییە زانیاری بێ سنوورت هەبێت.

دەیتوانی بە شێوازێكی جوان مۆڵەت بخوازێ و كۆبوونەوكە جێبهێڵێت، یاخود هەوڵبدات گوێ بگرێت تاوەكو شتێك كە تازەیە بۆی فێرببێت..

دەبێت بیرۆكەی گۆڕینی بابەتی قسەكردنەكەیان لەمێشكی خۆی دەربهێنێ.

ئەمە هەڵەیەكی كۆنە، كاتێك ئەوانەی دانیشتوون چێژ دەبینن لەو گفتوگۆیە، لە ئادابی قسەكردندا نییە ڕاستەوخۆ بابەتەكەیان لێ بگۆڕیت. بە ویستی خوای گەورە لەم كتێبەدا باسی چۆنیەتی گۆڕینی بابەتی قسەكردن دەكەین بەشێواز و ئەدەبێكی جوان، ناڕەحەتی بۆ ئەوانی دیكەش دروست نەكەیت و تووشی

شەرمەزاری نەبیت. بەهەرحاڵ، بۆ ئەم هاوڕێیەمان بێدەنگی زۆر باشتربوو لەوەی قسەیەکی بێ مانا بکات. پەندێکیش هەیە دەڵێت: ئەگەر قسەکردن زیو بێت ئەوا بێدەنگی ئاڵتونە. ڕاستی زیو نرخێکی هەیە، بەڵام قسەی هاوڕێکەمان لە خۆڵ بوو، چاو کوێر دەکات و لوت و گوێ دادەخات، لەبەر ئەوەی قسەکانی هیچ هاوتا نەبوو لەگەڵ ئەو بابەتەی ئەوانی تر گفتوگۆیان لەبارەوە دەکرد.

وەکو ئەو کەسە وایە بانگێشتی ئاهەنگێگ کرابێ لە هۆتێلێکی پێنج ئەستێرە و بڕیاری دابێت بەسەلیقە بێت و بیەوێت خەڵاتێک بدات بەبوکەکە، هەر بۆیە دەچێت قاپێک (بسبوسة بالمکسرات) جۆرێکە لە شیرینی پێشکەشی بوکەکەی دەکات.

هەڵوێستێکی نامۆیە، دیارییەکە بەتامە بەڵام شایستە نییە، هاوڕێکەمان ڕەتی دەکاتەوە کەسێکی ئاسایی بێت، هەر بۆیە دەیەوێت مرۆڤێکی خاوەن " سەلیقەیەکی گاڵتەجاڕ بێت" هەر بۆیە سەرئەنجام ئابڕووی خۆی دەبات و ئەوانەی چواردەوریشی شەرمەزار دەکات، خۆزگە هیچی پێشکەش نەکردایە، خۆزگە بەبێ دەنگی بچوایەتە ژورەوە تاوەکو خۆشی و ئەوانی دیکەشی لە شەرمەزاری پاراستبا.

هەروەها زۆر کات هەندێ قسە هەن زۆر گرنگن بەڵام، کاتەکەی گونجاو نییە بۆ ئەوەی بوترێت. کەسی وا هەیە کاتێک لەسەر مێزی نان خواردن دادەنیشێ لەگەڵ خێزان و هاورێکانی دەست بەباسکردنی کێشە تەندروستییەکانی دەکات لەوانە باوبژی نێو سکی، توشبوونی بە قەبزی، دەست بە وەسفکردنی ئازارەکانی دەکات لە کاتی چوونی بۆ دەستشۆر.)

ئەم قسانە ڕەنگە لەکاتی سەردانیکردنی دکتۆر زۆر گرنگ بن بوترێن، بەڵام زۆر قێزەون و نارێکە باس بکرێت لەکاتی نان خواردن، لێرەدا بێدەنگی باشترە. چونکە هەموو قسەیەک کات و شوێنی خۆی هەیە.

***

## لە یۆنان

گوێبگرە، گوێبگرە، هەرچەندی دەتوانی گوێبگرە، بزانە گوێگری باش ئەگەر بەخێرایش نەبێت دڵی ئەوانی دیکە زۆر بە قوڵی بەدەست دەهێنێ. هەمووان حەزدەکەن باسی خۆیان، کێشەکانیان، سەرکەوتنەکانیان، مناڵەکانیان بکەن، بەڵام زۆربەی کات گوێگرێکی باشیان دەست ناکەوێ. مەبەست لە گوێگر; ئەو کەسەیە گرنگی دەدات بەو شتانەی قسەکەر باسیان لێوەدەکات، هەندێ کەس هەن گوێت لێ دەگرن، بەڵام بیرو هۆشیان لەشوێنێکی دیکەیە..

هەندێ کات لەگەڵ خۆمدا یارییەک دەکەم ناوی (لە یۆنان)ە، هەست دەکەم ئەوکەسەی قسەی بۆ دەکەم تەنها سەرم بۆ یەجوڵێنێ و بیرو هۆشی لای من نییە، لە چاوەکانیاندا هەست دەکەم بیر لەشتێک دەکاتەوە و تەنها وا خۆی دەردەخات کە گوێی لێمە، هەربۆیە لە ناوەڕاستی قسەکردنەکەمدا وشەی (لە یۆنان) بەکاردەهێنم.

هەرچەندە ئەوەی باسمکردووە دوور و نزیک هیچ پەیوندی بە یۆنانەوە نییە، دەبینم هەر سەری دەلەقێنی وەک ئەوەی هیچ وشەیەکم بەکار نەهێنابێت جیاواز بێت لەوەی قسەم لەسەری کردوووە، بەدڵنیاییەوە لای ئەو بابەتەکە دەگۆڕم، چونکە بۆم

دەرکەوت هیچ گرنگییەک بەقسەکانم نادات. کێشکە ئەوەیە پارێزگاری دەکەم لەوەی گفتوگۆکەم لەگەڵ ئەم کەسەدا بە ئارامی تێپەڕێت، هەر بۆیە قسەکردنم بۆ ئەم بێ هۆشە ئارامم ناکاتەوە، بەڵکو وام لێ دەکات بابەتێک ببینمەوە تاوەکو سەرەنجی بەلای خۆمدا ڕاکێشم. بێگومان ئەگەر کێشەیەکم هەبێت و پێویستم بەکەسێک هەبێت تاوەکو دڵمی بۆ بکەمەوە، ئەوە پێوستە کەسێک بێت گوێم بۆ بگرێت نەوەکو ئەم کەسێک بێت تەنها سەریم بۆ بجوڵێنی.

کەواتە ئەم کەسە سەر جوڵاوە مەبە!

ئاگاداربە، ڕێزی قسەی ئەوانی دیکە بگرە، تەنانەت ئەگەر سودیشی نەبوو بۆت، تەنانەت ئەگەر هەستت بە بێزاریش کرد هەوڵبدە لێهاتووانە بابەتەکە بگۆڕی، یان ڕوخسەتی ڕۆشتنی لێبخوازە پێش ئەوەی بچیتە قۆناغی سەر لەقاندنەوە.

## ئەی هاوار!!

لەلایەکی تر هەندێک کەسی وا هەیە زیادەڕۆیی دەکات لە دەرخستنی گرنگی دانیان بە وتەکانی قسەکەر، هەر بۆیە برۆکانی بەڕادەیەک بەرز دەکاتەوە تاوەکو دەگاتە قژی سەری، دواتر دەڵێت: ئەی هاوار، شتی وا نـــــابێت!!

قسەکەش هیچ پێویستی بەو هەموو هەڵچوونە نییە..

کابرا دەڵێت: کوبري ستة اکتوبر (شوێنێکە لە میسر) دوێنێ ئێوارە زۆر قەرەباڵغ بووە.

شتێکی ئاساییە، ئەم هەموو هەڵچوونەی ناوێت. ئەمە وا دەکات قسەکەر هەستبکات گاڵتەی پێدەکات یان قسەکەی لا کەمە یان وا هەست بکا تەنها نمایش دەکات. زیادەڕۆیی لە کادانەوەکان متمانە لەناودەبات. لێردا بێدەنگی یان جوڵەیەکی سادە بە سەر یان چاو زۆر لەو هەڵچوونە باشترە.

جۆرێکی تر هەیە لە زیادەڕۆیی کادانەوەی زۆرێک لە گوێگران، ئەویش بریتییە لە بەکارهێنانی هەمان وشە بە بەردەوامی تاوەکو هانی قسەکەر بدات بەردەوامبێت لە قسەکانی، لەوانە: بەڵێ، بەڵێ... یان هممم، هممم!! هەزار جار دووبارەی دەکاتەوە. هەرچەندە ئەم ڕێگایە زۆر بێزارکەرە بۆ قسەکەرەکە،

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەستە لەلای قسەکەر دروست دەکات کە کەسەکە هیچ گوێ بە قسەکانی نادات بە پێچەوانەی ئەوەی وا خۆی دەردەخات، چونکە ئەستەمە هەموو وتەکانی پێویستی بە هەمان کاردانەوە بووبێت.

هەندێ کات دەکرێ پێویست بکات گوێگری باش وشەکانی قسەکەر دووبارە بکاتەوە، بەڕێگای خۆی دووبارەی بکاتەوە، بۆ نموونە هەمان قسەی بێژەرەکە بە تۆنێکی دەنگی جیاواز دووبارە بکاتەوە یان گوزارشتێکی گونجاوی بۆ زیاد بکات، ئەمەش ڕێگە پێدراوە. گوێگرتنی بەردەوام بەبێ سەرەنجێکی (تعليق) وتراو یان ئاماژەیی بۆ ماوەیەکی زۆر ڕەنگە قسەکەر توشی دوودڵی بکات، یان هەست بە ئاسودەی نەکات، ئەمەش لە گفتوگۆیەکی سەرکەوتوودا ڕێگە پێدراو نییە.

ڕاستە هەندێ کات هیچ سەرەنجێک یان ئاماژەیەک ناکەین بۆ ئەوەی وا لە کەسی بەرامبەر بکەین هەست بە نائارامی بکات. یاخود بە ئارەزوو دەمانەوێت قسەکەر هەست بە سەلامەتی نەکات، ئەمەش لەکاتی دانوستاندا ڕوودەدات. بەڵام ئەم ڕوکەشە بەستەڵەکییە بەتاڵە لە گوزارشتکردنی هەست و پرە

لە بێدەنگییەکی تۆقێنەر پێشنیار ناکرێت لەگەڵ کەسی ئاسایی بەکاربێت.

(ڕاهێنان کردن لەسەر گوێگرتن کارێکی زۆر گرنگە، بەتایبەت بۆ ئەوانەی ڕانەهاتون گوێ بگرن لەوانی تر، هیچ ڕێگەیەک نییە جگە لەوەی ڕاهێنان بکەن، چونکە یەکەم سیفەتی قسەکەری سەرکەوتوو بریتییە لە گوێگرێکی لێهاتوو.)

کەسی وا هەیە دەڵێت: ئەمڕۆ لەگەڵماڵەوە یان هاوڕێکانم یان هاوکارەکانم دادەنیشم بۆ ئەوەی ڕاهێنان بکەم لەسەر گوێگرتنی زیرەکانە. تەنها بەشداری دەکات بە خستنەڕووی سەرەنجی سادە، یان پرسیارێک تاوەکو هانی بەرامەرەکەی بدات بەردەوام بێت لە قسەکردن. ئەو ڕاهێنانە ئاسان نییە بەو جۆرەی دەردەکەوێت، بەتایبەت بۆ ئەوانەی وا ڕاهاتوون زۆر قسەبکەن و کەم گوێ دەگرن. بەڵام بەتێپەڕبوونی کات و هەستکردن بەوەی خەڵکی لەمەوبەدوا لەگەڵیدا گرنگی بە قسەکردن دەدەن، لەگەڵ هەستکردنی بە گۆڕانگاری لە لایەنی کۆمەڵایەتی، گوێگرتنی زیرەکانە دەبێتە خوێکی جوان ئەستەمە وازی لێ بهێنێت.

ئەم جۆرە ڕاهێنانە بەتایبەتی زۆر گرنگە لە ماڵەکاندا، ئاخۆ چەند خوشک و برا و دایک و باوک هەن وردەکاری گرنگی یەکتر

لە هەمان خێزاندا نازانن. نە کەم نە زۆر لەبارەی هاوڕێ ڕاستەقینەییەکانیانەوە نازانن، ڕەنگە لەدەرەوەی ماڵ ئاگاداری وردەکاری ژیانی ڕۆژانەی خۆشیان نەبن، وەک خەونی ڕاستەقینەیان چییە؟ کێ نموونەی باڵایانە؟ ئەو کەسە پێغەمبەرە (د.خ)، یان کەسێکی سیاسەتمەدارە، یاریزانێکی تۆپی پێیە، ڕاگەیانکارێکە، بانگخوازێکی ئایینییە، سەرمایەدارێکە، ئەکتەرێکە؟ سەماکارێکە، یان زانایەکی بواری زانستی بۆشای ئاسمان؟ ئەوان چونکە گوێ ناگرن هیچ زانیارییەکیان لە بارەوە نییە..

چۆن هەموو ئەمانە دەزانین بێ ئەوەی هەوڵ بدەین گفتوگۆکان بەڕێوبەرین و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ گوێ بگرین؟

ئەگەر ئەندامانی خێزانەکان نیوەی ئەو گرنگییانەی دەیبەخشن بە زنجیرە دراماکان، بەرنامە ئایینییەکان، هەواڵەکان، بابەتە کۆمەڵایەتییەکان، سیاسییەکان لە شاشەی تەلەفیزۆنەکانەوە پەخشدەکرێت، هەمان گرینگیان ببەخشیایە بەیەک تر، ئەوا ئێستا بارودۆخی خێزانەکان باشتر دەبوو.

هەندێ کات ناچارین گوێ لە کۆمەڵە بابەتێک بگرین کە بە هیچ جۆرێک گرنگ نییە. ڕاستی ئەوەیە هیچ مرۆڤێ ناتوانێ بەشێوەیەکی ئەرێنی گوێ لە کەسانی دی بگرێت مەگەر لە

بنەڕەتدا بایەخبدات بە بابەتەکە; بەم جۆرە تەرکیز پەیدا دەبێت.

ئەمەش وشە نهێنییەکەیە...

بایەخ بە قسەکەر بدە زیاتر لە بایەخدانت بە بابەتی ئاخاوتنەکە!

بابەتی ئاخاوتنەکە هەمیشە گرنگ نییە، بەڵکو هەندێ کات قسەکەر زۆر بە بایەخترە!!

ڕەنگە هەندێ کەس بپرسێ، " ئەی ئەگەر ئەو کەسەی کە قسەدەکات لە بنەڕەتدا بایەخی نەبێ بۆم ... ئەی ئەگەر هەر پێویست بوو لەسەرم گوێی لێ بگرم، چۆن بتوانم بڕوا بەخۆم بێنم بایەخدارە تاوەکو بتوانم بە باشی و بەبێ زۆر لەخۆکردن گوێی لێ بگرم؟ بۆ زانیاریت ڕەنگ کەسێکی زۆر ئاسایش بێت، زۆر ڕوکەشی بێت، بێزارکەر، وشک، تەنانەت ئەگەر کەسێک بێت ڕقی لێم بێت، حەز باچاکیم نەکات، بەڕاستی یەکێ لە دوژمنەکانم بێت؟ ئەو کات چی پێویست دەکات تاوەکو بتوانم گوێی لێ بگرم!؟"

لێرەدا دەڵێین ڕاستییەکی پێویستە بایەخ بەخەڵکانی دیکە بدەین، ئەمەش بانگەشە نییە بۆ بەخشینی شەممە تاوەکو ئەوەی ئەتەوێ لەیەک شەمەدا بەدەستی بهێنی، واتا بایەخ

بەخەڵکی بدەی لەبەر ئەوەی ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆش پێویستیت بەوان هەبێت، من وەکو خۆم بەهیچ جۆرێ لەگەڵ ئەوقسەیە نیم؛ لەبەر ئەوەی هیچ ڕۆزیدەر و پاڵپشتێک بوونی نییە تەنها خوای گەورە و میهرەبان نەبێت. من بانگی خەڵکی ناکەم لەسەر بنەمایەک پەیوەندی هاوڕێیەتی بنیات بنێن تەنها بۆ ئەوەبێت لەکاتی تەنگانە کەسەکە بەهانایەوە بێت. بەڵکو هەموو ئەو پەند و قسانەی هەن و باس لەوە دەکەن ئەوەی پشتی هەبێت لە سکی نادرێت، یان ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش، هەموو ئەمانە بێ بنەمان، لانی کەم ئەمە بیروڕای منە دەربارەی ئەو جۆرە قسانە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا خۆشەویستی خەڵکی هێزە. نەوەکانی ئادەم (سەلامی خوای لێ بێت) لەسەر زەوی مرۆڤی ڕاستگۆ و پڕ لەهەست و سۆزن، و ئەوانەش کە گرینگیان پێدەدات خۆشیان دەوێن. خەڵکی ئەو کەسەیان خۆش ناوێ کە زۆر باسی خۆی دەکات، مرۆڤیش سروشتی وایە زۆر قسە ناکات مەگەر بۆ ئەوە بێت سەرەنجی ئەوانی دیکە بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، یان کەسی لەخۆی گرنگتر لە دانیشتنەکدا بەدی نەکات، چونکە بابەتەکانی ئەو لەهی ئەوانی دیکە گرنگترە و هی ئەوان بایەخی نییە، بە کورتی ئەوانی دی هەر گرنگ نین.

هەر لێرەشەوە کێشە سەرهەڵدەدات..

هەموو مرۆڤێک بایەخێکی گەورەی هەیە بۆخۆی، هەر بەهۆی ئەم بە بایەخ بوونەشییەوە مرۆڤ گرنگی دەدات بە بابەت و کێشەکانی ژیانی، ئەگەر کەسێکی دەست کەوت بایەخ بە شتە گرنگەکانی بدات، ئەوا بەڕاستی خۆشی دەوێت، یان لانی کەم هەست بە ئاسودەیی دەکات لەنزیکییەوە؛ چونکە لە کاتێکدا گوێی لێ دەگرێت هیچ کەس ئامادە نییە گوێ لەکەسی تر بگرێت، هیچ کەس ئامادە نییە بایەخی ڕاستەقینە بە کەسێکی تر بدات مەگەر چاوەڕێی شتێک بێت بەرامبەر ئەو بایەخدانە دەستی بکەوێت..

(ئەو شتەی دەمەوێ ئامارەی پێبکەم، ئەوەیە: تۆ شتێکی بەنرخت لەخەڵکی دەوێ زۆر بەنرخیش، ئەگەر توانیت ئەوە بەدەست بێی ئەوا تۆ دەوڵەمەندترین کەسی؛ ئەو شتەش بریتییە لە دڵی خەڵکی.. بۆ ئەو مەبەستەش پێوست دەکات زۆر بە دڵسۆزی گوێیان لێ بگریت تاوەکو ئەم دڵە بەنرخانە بەدەست بهێنی.)

# پێڵاوی پاژنە بەرزی چی کوڕی ...

ماوەیەک لەمەوپێش لە یەکێک لە گۆڤارە هونەرییەکاندا بابەتێکم خوێندەوە باسی یەکێک لە هونەرمەندە پیاوە سینەماکارە یەکەمەکانی ئەمەریکا بوو، باسی لە کێشەیەکی گەورەی خۆی کردووە بەسەریدا هاتووە. کێشەکەی ئەوەیە هاوسەرەکەی چەند سانیمەترێک لەخۆی بالآی بەرزترە.

ئەم هونەرمەندەش لەبەر ئەوەی کەس هەست بە بابەتە نەکات پێڵاوێکی تایبەتی پاژنە بەرزیان بۆ دروستکردووە، پێڵاوکە پێوەی دیار نییە کە پاژنە بەرزە، تەنها بۆ پێویستی کاری هونەری و ناوبانگی بەکاری هێناوە کاتێک کە لەگەڵ هاوسەرەکەی لەبەردەم ڕاگەیاندکاران و ڕۆژنامەنووسان دەرکەوتنایە. ڕۆژێک پێکەوە بۆ گەشتێک دەرچوون، لەو شوێنەش پەخشێکی ڕاگەیاندن هەبووە لەبارەی گەشتەکەیانەوە، بەڵام دواتر لەناو فرۆکەکە هونەرمەندەکە بۆی دەرکەوتووە کە پێڵاوەکەی لا نییە، چۆن بتوانێ لە فڕۆکەکە دابەزێت لەگەڵ خێزانە بالا بەرزەکەی بەبێ پێڵاوە پاژنە بەرزەکە؟ ڕەنگە لەمەبەدوا خەڵکی بەبچووک وێنای بکەن، بڵێن کەسێکی گونجاو نییە بۆ ئەوەی ڕۆڵی کارەکتەری بەهێز و

سەرەكی پێبدرێت تاوەكو لەدژی هێزی خراپەكاری بجەنگێت لەسەر زەوی.

ئەگەر پێشی هاوسەرەكەی بڕوات و دووربێت لێی تاوەكو هەستیان پێ نەكرێت، ڕەنگە پڕوپاگەندەی زۆر لەبارەیانەوە بڵاوببێتەوە گوایە لەگەڵ هاوسەرەكەی نێوانیان تەواو نییە. ئەمەش قازانجی نابێت لەو فیلمەی كە ڕۆڵی تێدا دەگێڕێت، چونكە بابەتی فیلمەكە ڕۆمانسیەتە، و هەردوو كارەكتەرەی فیلمەكە زۆر یەكتریان خۆش دەوێت، هەر بۆیە دەبێت زۆر خۆشەویستی و ڕۆمانسیەت بەدیار بخات لەبەردەم ڕاگەیاندنەكاندا لانی كەم تا ئەوكاتەی فیلمكە نمایش دەكرێت و ملیۆنەها دۆلار بەدەست دەهێنێ، ئەوەش ئەو بڕە پارەیەیە كە گرێبەستەكەی لەسەر ئەنجامدراوە.

با ئێمەش بیهێنینە پێش چاوی خۆمان لەسەر هەمان فرۆكە گەنجێك هەیە، بۆ ئەوەی بابەتەكە ئاڵۆزتركەین وا دابنێ خەڵكی شوێنە هەژار و نەخوێنەوار نشینەكانە.

بێنە پێش چاوی خۆت لەو گەڕەكەی ئەم گەنجە تێیدا دەژی بۆ ماوەی دە ڕۆژە ئاویان نییە، ناچارە بەرد لە ناو جۆگەلەی ئاوەكان دابنێت تا بپەڕێتەوە و بگاتە پاسێك و خۆی پێیدا هەڵواسێت، پاشان بیگەیەنێتە پاسێكی تر و لەكۆتایدا بگاتە

فرۆکەخانە. چونکە دەیەێت گەشت بکات/ ڕاکات بەدوای پارەوە نانێکدا. بێنە پێش چاوی خۆت ناچاربووە کاسێتەکانی باوکی و نیشانی دەستگیرانەکەی بفرۆشێت. هەموو ئەمانە لەپێناو ئەوەی کاتێک گەڕایەوە برە پارەیەکی هەبێت تا لە گەڕەکێکی خراپتر لەوەی تێیدا دەژی خانووەیەک بکڕێت و هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کچەدا بکات کە ئەسڵەن خۆشی ناوێت، بەڵام تەنها کچێکە بەو بارودۆخەی ئەو ڕازی بووە سەرەڕای سەختی بارودۆخی گەنجەکە، ئەویش تەنها بۆ ئەوەی بە قەیرەی نەمێنێتەوە.

بە ڕێکەوت یان هەرشتێکی دیکە ئەم گەنجە هەژارە لەگەڵ ئەو ئەستێرە بەناوبانگە پێکەوە لەسەر هەمان فرۆکەبن، ڕەنگە بڵێن چۆن دەکرێ کەسێکی وا هەژار و نەخوێنەوار لەگەڵ ئەکتەرێکی بەناوبانگ پێکەوە گەشت بکەن، ئەوە گرنگ نییە چونکە ئەوەی باسی دەکەین تەنها نموونەیەکە بۆ ڕونکردنەوە. بەهەرحاڵ ئەوان پێکەوەن، بەهیچ شێوەیەکیش یەکدی ناناسن، بەڵام ئەستێرە بەناوبانگەکە قسە بۆ هاوڕێ هەژارنشینەکەمان دەکات دەربارەی کێشەی پێڵاوەکەی و لەوپەڕی ڕاڕای و دڵەڕاوکێدایە و دەپرسێ; ئاخۆ چی بکات بۆ ئەوەی لەو کێشەیە ڕزگاری بێت..

بێنەپێش چاوت ئەو ئەستێرە بەناوبانگە چەن سادە مامەڵە لەگەڵ ئەو گەنجە دەکات و قسەی لەگەڵ دەکات، بگرە هاوبەشی ئەم کێشە تایبەتییەی خۆی دەکات!

ئەم هەڵوێستە بێنەپێش چاوی خۆت!!

پێشبینی دەکرێت دوای ئەوەی گەنجەکە گوێبیستی کێشەی ئەستێرە بەناوبانگەکە دەبێت، پێڵاوە زۆر سادەکەی لەپێ دابنێ، بەڵام نەک بۆ ئەوەی هاوسۆزی خۆی پشان بدات و بیداتێ، بەڵکو بۆئەوەی بیکێشێ بەسەریدا، دواتر بۆ نموونە پێی بڵێت: ئەی پیاو ئێمە جەهەنەم بەڕێ دەکەین، سوێند بەخوای گەورە هەیە لەسەر شەقامەکان دەخەوێت لە چلەی زستاندا، تۆش باسی ئەوەم بۆ دەکەی زۆر خەمت هەیە و خێزانەکەت لەخۆت باڵای بەرزترە؟ براکەم لێی جیابەرەوە و لێ گەڕێ بابەناخی زەویدا ڕۆچێتە خوارەوە. هەر لەتۆم کەم بوو واللە!! من هەرچی هەمە و نیمە فرۆشتومە و هاتومەتە ئەم وڵاتەی ئێوە بە هەزار حاڵ کارێک دەکەم. تۆش هاتووی دەڵێی هاوسەرەکەم و فیلمەکەم و پێڵاوی پاژنە بەرز... پێڵاوی پاژنە بەرزی چی کوڕی ...

تۆ دەبێ سوپاسی خوا بکەی بۆ ئەو هەموو شتەی هەتە، ئەوە هەموو نیعمەتی خوایە گەشت دەکەی، پارەت هەیە، ناوبانگت

هەیە، وە...وە....هتد" ئەمە ئاوازێكی واقعییە، پڕە لە دەستەواژەی ناشرین كە لێی ڕاهاتوین و لێمان ڕاهاتووە.

كاتێک كاردانەوەی هاوڕێكەمان دەخوێنینەوە بۆمان دەردەكەوێ هاوڕێكەمان قسەكانی خۆی پێ دروستە، كاتێک گوێ بیستی ئەو كێشە بچووكانە دەبێت بەراورد بە هی خۆی. بەڵام بەداخەوە بۆ برا ئەستێرەكەمان بەهیچ جۆرێ كاردانەوەی گەنجەكە گونجاو نییە، چونكە بەڕاستی لە كێشەدایە بەهۆی ئەو پێڵاوانەوە، سروشتی كێشەكانی ئەو بەوشێوەیەیە، ژیانی بەو شێوەیە، مەبەستی خۆ دەرخستن نەبووە ناشیەوێ دوژمن بۆخۆی پەیدا بكات، بەڕاستی ئەو لە دڵەڕاوكێدایە و دەیەوێت چارەسەری كێشەكەی بكات.

ئەگەر چی ئەم نموونە خەیاڵاویە زێدەڕۆی تێدایە، بەڵام بەشێوەیەک لە شێوەكان بەسەر هەمووماندا هاتووە... كەسی وا هەیە باسی بابەتێک یان كێشەیەک دەكات، بەڵام گوێگر هیچ بایەخی پێنادات، ڕەنگە بەراوردی بكات لەگەڵ كێشەكانی خۆی پاشان تەركیز و گرنگی بە قسەكانی نەدات وەكو بێ هۆشی لێدێت، یان ڕەنگە دەست بە بڕینی قسەكانی بكات. قسەپێ بڕینەكە دەكرێ بە قسەكردن، ئامارە، بێ ئاگابوون، یان هەرشتێكی تر بێت. ئەمەش دەمانخاتە بەردەم بابەتێكی تر كە

زۆربەمان ڕووبەڕووی دەبینەوە لە مامەڵەکردنی ڕۆژانەماندا، ئەویش بابەتی قسە پێ بڕینە، لە دەروازەی داهاتوودا بە وردی لەسەری دەدوێین بەویستی خوای گەورە...

بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەکردنە بە گوێگرتنی باش کە: بریتییە لە جیاکردنەوەی ئەزموونی خۆم لەو بابەتەی کە لایەنی بەرامبەر باسی لێوە دەکات، پاشان ئەو شتانەی بەرامبەرەکەم باسی لێوە دەکات دەبێت لە چوارچێوەی بارودۆخی ئەودا دەیبینم نەوەک هی خۆم.

بۆنموونە، کەسێک باسی خۆشەویستەکەی لای هاوڕێکەی دەکات و چۆن حەز بەمردنی خۆی دەکات نەوەک ئەوەی لێی دوورکەوێتەوە، بەڵام هاوڕێکەی پێی وایە ئەو کچە بەهیچ جۆرێ شایەنی ئەو هەموو خۆشەویستی و ئازارچەشتنە نییە، "تەنانەت ئەگەر وازیشی لێ بێنی زۆرباشترە بۆت" بەو شێوەیە هاوڕێکەی ڕەتی دەکاتەوە گوێ لە قسەکانی بگرێت، یان ڕەنگە دەست بکات بە گاڵتەکردن بە شێوە و ڕوخسار و ماڵی کچەکە.

ئەو لە هەستەکانی خۆیەوە لەبارەی ئەو کچە دەدوێ، بەڵام باشتر وایە خۆی لەشوێن هاوڕێکەی دابنێت، هەوڵ بدات لە ڕاستی هەستەکانی تێبگات.

دەتوانێ بە شێوازێکی جوان ئامۆژگاری بکات لێی دوور بکەوێتەوە یان ڕووی نەداتێ لەبەر ئەو هەستە ڕاستەقینەی هاوڕێکەی هەیەتی، ئەگەر وا نەکات و بەردەوام بێت لە گاڵتەکردن بە کچەکە، ڕەنگە هاوڕێکەی لەدەست بدات، نەک لەبەر ئەوەی پشتگیری ئەو جۆر پەیوەندییە ناکات بەڵکو لەبەر ئەوەی بایەخ بە هەست و بارودۆخی هاوڕێکەی نادات لەو کاتە سەختەی تێیدایە.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە بنەڕەتدا گوێگرتنی زیرەکانە دەکرێ لەناو بچێت، ئەگەر گوێگر کۆنترۆڵی هەندێ خوویی نابەجێی خۆی نەکات، زۆربەی گفتوگۆکان لەناودەبات. خراپترینیان بریتییە لە قسە پێ برین ئەویش لە دەروازەی داهاتوو باسی لێوە دەکەین.

❊❊❊

# قسە پێ برین

پچڕاندنی قسەکەر خووێکی زۆر ناشرینە لای ئێمە، زۆربەی کات ئەم خووە دەگەڕێتەوە بۆ پێنج هۆکار:

١. گوێگر هیچ بایەخی نەبێت بۆ قسەکەر یان بابەتی ئاخاوتنەکە، هەر بۆیە دەیەوێت ڕێڕەوی باسەکەیان بگۆڕێت.

٢. یان بەهۆی بیردۆزە بەناوبانگەکەی "هەروەها منیش".. یانی لێرەدا گوێگر کەسی قسەکەر دەبڕێت تەنها بۆ ئەوەی بڵێ منیش هەمان شتم ئەزموون کردووە، ئینجا دەست دەکات بەگێڕانەوەی چیرۆکی خۆی پێش ئەوەی قسەکەر تەواوبێت.

٣. جۆری سێیەم، ئەمیان پێشەوایە... قسە دەبڕێت بۆ ئەوەی لاری خۆی پیشان بدات و وتەکانی قسەکەری بەدڵ نییە، یان هەر خودی قسەکەری خۆش ناوێت، هەربۆیە گوێی لێ ناگرێت.

٤. جۆری چوارەم، تەنها بۆ پیشاندانی پاڵپشتی کردنی وتەکانی قسەکەر، بەهۆی زۆر ڕازی بوونی ناهێڵێت قسەکەر ڕستەکەی تەواو بکات ئەم بۆی تەواو دەکات، بەڵام مەرج نییە هەمان ئەوشتە بڵێ کە قسەکەر مەبەستی بووە بیڵێت.

٥. جۆری پێنجەمیش بە مەبەستی پێکەنینە. بیردۆزێکی دیکەی میسرییە "بەپێی هەمان سەرواو قافیە وەڵامدەداتەوە بە مەبەستی گاڵتەجاڕی" (افیە تحکم)

کەواتە با ئەم هۆکارانە و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیان بخەینە ڕوو...

***

# جۆری یەکەم

## قسەبڕین بەهۆی بایەخ نەدان بە قسەکەر و ئەو بابەتەی باسی دەکات

دەبینین هەندێ کەس ئەگەر بایەخی نەدا بە ئاخاوتنەکە زۆر لەناکاو بابەتەکە دەگۆڕێ بۆ شتێکی دیکە، بۆ نموونە گفتوگۆیەکی لەم جۆرە دەبێت:

کەسی یەکەم: بێگومان باش دەمناسی هەرگیز لە مافی خۆم خۆش نابم، بۆیە پێم گوت سنوری خۆت مەبەزێنە، بەڵێ ڕاستەوخۆ وام پێ وت.."

کەسی دووەم: "ئەها بەڵێ بەڵێ، ئەرێ براکەم ئەزانی یارییەکەی دوێنێ زۆر بەهێزبوو..."

کەسی یەکەم: بەڵێ وابوو، بەهەرحاڵ، پێم گوت نە تۆ و نە دەی وەک تۆ ناتوانن شتی وابکەن، تۆ بیرت چۆتەوە کێی؟!

کەسی دووەم: ئەرێ تۆ برسیت نییە؟ بۆ نەچین شتێ بخۆین؟

کەسی یەکەم: شتێ بخۆین؟ باشە. بەهەرحاڵ، چووم بۆ یاداشتنووسی کارگێڕی و هەموو شتێکم بۆیی ڕوونکردەوە.

ئەگەر خاوەن قسەکە کەسێکی تێبینی کار بێت، بە ئاسانی درک بەوە دەکات کە کەسی دووەم هیچ بایەخ بە قسەکانی نادات، بۆی دەردەکەوێت وتەکانی بەکەم دادەنێ، گاڵتە بە خودی قسەکەر دەکات. کەسی دووەمیش لەوپەڕی نائارامیدایە و نازانێ چۆن باسەکە بگۆڕێت.

لە گفتوگۆیەکی لەم شێوەیە چاوەڕوانی چی دەکرێت ؟ چی دەرئەنجامێکی ئەرێنی بوونی دەبێت کاتێک لایەنی بەرامبەر تەنها خەمی ئەوەیەتی بابەتەکە بگۆڕێت.

ئامۆژگاری کەسی دووەم دەکرێت بەوردی گرنگی بە گفتوگۆکە بدات، دواتر هێواش هێواش لە کێشەی کارەکەی کەسی یەکەمەوە دەست پێ بکات دواتر بابەتەکە بگۆڕێت بۆ بابەتی یارییەکە.

بۆ نموونە:

کەسی یەکەم: بێگومان باش دەمناسی هەرگیز لە مافی خۆم خۆش نابم، بۆیە پێم گوت سنوری خۆت مەبەزێنە، بەڵێ ڕاستەوخۆ وام پێ وت.."

کەسی دووەم: بەڵی، من دەتناسم حەز بەبێ ڕێزی ناکەی، گرنگترین شت شکۆ و ڕەوشتی مرۆڤە. ئەزانی تۆ ئەوەم بەبیر

دەهێنیتەوە کە ابوتربکة (یاریزانێکە) دوێنێ شەو کردی؟ ئەم پیاوە بەڕاستی زۆر بە ڕەوشتە و بەڕاستی یاری زۆر جوان دەکات، گوڵێکی زۆر نایابی تۆمارکرد. (پاشان ئەگەر ویستی دەتوانێ دەست بکات بە قسەکردن لەبارەی یاری تۆپی پێیەکەوە).

ئەگەری زۆرە لەسەرەتادا یان لە جاری دووەم و تەنانەت سێیەمیش سەرکەوتوو نەبێت لەم ئەزموونەدا، بەڵام شێوازێکی ئاسان و جوانە بۆ گۆڕینی بابەتی ئاخاوتن بەجۆرێک کەسی بەرامبەر هەست بەشەرمەزاری نەکات. نابێت ئەم ڕێگایە بەکاربهێنرێت ئەگەر نا کاریگەری لەدەستدەدات، بۆیە تەنها لەکاتی تەنگانە و ئەوپەڕی ناڕەحەتیدا بەکاری بهێنە.

بێگومان لێرەدا ئامۆژگاری کەسی یەکەمیش دەکرێت کە چاودێری کاردانەوەکانی کەسی دووەم بکات بە ئەندازەی گرنگیدانی بە وتەکانی، کاتێک قسەکەر تێبینی ئەوەی کرد کەسی بەرامبەری پێداگرە لەسەر گۆڕینی بابەتەکە، زۆر ڕوونە کە کەسی دووەم هیچ بەپەرۆش نییە دەربارەی ئەو بابەتە. بەڵام ئەگەر هاتوو بابەتەکە زۆر گرنگ بوو هەمیشە پێویست ناکات بابەتەکە بگۆڕدرێت، چونکە پێویستە لە ئێستادا باسی

لێوە بکرێت، هەر بۆیە لەم حاڵەتەدا تەنها پێویستە شێوازی باسکردنەکە بگۆڕدرێ نەوەک خودی باسەکە.

هەمان ئەم ڕێگایەیی مامۆستایەکی لێهاتوو بەکاری دەهێنێت..

پێویستە مامۆستا تاوەکو کۆتایی دەرس شەرح بکات تەنانەت ئەگەر بابەتەکەش بێزارکەربێت و بەلای ئامادەبووانەوە هیچ بایەخێکی نەبێت. بەڵام ڕێگە و شێوازی وانەوتنەوەکە زۆر کاریگەری دەبێت لەسەر زیاد سەرەنج ڕاکێشانی گوێگرەکان و گەیاندنیان بە ئامانجی خوازراو.

زۆربەمان لێهاتووی شیخ (الشعراوی)مان دێتە یاد کە چەند شارەزابووە لە خستنەڕووی واتا زمانەوانییەکان و بیروبۆچوونەکانی دەربارەی قورئانی پیرۆز، بابەتەکە قورس و وشکە بەتایبەت بۆ ئەوانەی هیچ پێشینەیەکی ئایینی و زمانەوانیان نییە، بەڵام بە هەرشێوەیەک بێت توانیویەتی ملیارەها خەڵکی میسری و عەرەبی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و گوێ بەو باسە قوڵانە بدەن. شیخ نەچووە ڕاستی و بیروباوەڕو بنەماکانی ئایین بگۆڕێت بۆ ئەوەی بابەتەکە بۆ خەڵکی ئاسان بکات، باسەکانیشی نەگۆڕیوە بۆ شتی ئاسانتر تاوەکو سەرەنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشێت، بەڵکو تەنها ڕێگە و شێوازی باسکردنەکەی گۆڕیوە.

ئەگەر دەستت کرد بە باسکردنی بابەتێکی وشک و گران، یان بابەتێکی سیاسی، یان بابەتێکی زانستی ئاڵۆز، ئەو کەسانەش کە قسەیان بۆ دەکەین پسپۆڕ نەبوون لە بوارەکەدا، بۆ ئەوەی دڵیان بەدەستبهێنی پێویستە بە بەکارهێنانی دەستەواژە و هێنانەوەی نموونەی ئاسان بابەتەکەیان بۆ ڕوونبکەیتەوە. ڕەنگە هەندێ کەس تۆمەتبارت بکەن بەوەی دەستەواژەی نەگونجاو لەبارەی باسەکەوە بەکاردەهێنی. ڕەنگە لە دادگادا ئەمە ڕووبدات، چونکە ئامانجی تۆ گەیاندنی واتاکانە وەکو خۆی نەوەک خۆ نمایشکردن و سەلماندنی شکۆی خۆت بەسەر خەڵکی ئاساییەوە.

ئەگەر شێخ (شعراوی) - خوا لێی ڕازیبێت - وەکو ئەوانی دیکە باسی لەبابەتەکە بکردایە و ئامانجی گەیاندنی مەبەست لەباسەکە نەبووایە، وەکو ئەوانی دیکە دەبوو، لەسەر هەمان بابەت دواون و هیچ کەسیش گوێی لێیان نەگرتووە، ئەگەر چی ئەوانیش نیازیان پاکبووە. خوای گەورە زیاتر لە هەرکەسێک ئاگادارە بەوەی لە دڵی بەندەکاندایە.

پێشنیار دەکرێ لە نموونەی پێشتر، ئەوەی کە کێشەی لەکارەکەیدا هەبوو، شێوازی قسەکردنی بگۆڕێت، ئەگەر هەر

پێداگربوو لەسەر بەردەوامی لەقسەكردن، دەكرێ شێوازەكە لە گێڕانەوە بگۆڕێت بۆ پرسیاركردن..

واتا، دەبێت لەبری ئەوەی چیرۆكەكە بگێڕێتەوە دەستبكات بەپرسیاركردن لە لایەنی بەرامبەر: " بە بۆچوونی تۆ بەشێوەیەكی دروست مامەڵەم لەگەڵ بابەتەكە كردووە؟ باشە ئەگەر لەجێی من بویتایە چیت دەكرد؟"

بەم شێوەیە هەدوولا وەكو كەسی سەرەكی بەشدارەبن لە ئاخاوتنكە، نەوەك یەكێكیان بەناچاری گوێبگرێ و ئارامی نەماوە بۆ ئەوەی هەڵبێت و خۆی بشارێتەوە لە بابەتەكە.

هەندێ كات هەیە كەسی گوێگر بیروهۆشی بەشتێكەوە سەرقاڵە و لەوكاتەدا ناتوانێ هیچ ئامۆژگارییەک پێشكەش بكات، لەم حاڵەتەدا پێشنیار دەكرێ بەڕەوشتێكی جوان داوای لێبوردن بكات. چونكە ناتوانێ تەركیز بداتە قسەكانی كەسی بەرامبەر، بەڵام پێویستە جەخت لەسەر هۆكارەكەی بكاتەوە و لەبەر ئەوە نییە كە باسەكە بێ بایەخ بێت، تەنها ئەو زۆر سەرقاڵە بەو شتەی لە مێشكیدایە، یان دەتوانێ ئەوەی لە مێشكی دایە پێی بڵێت ئەگەر گونجاوبوو. بەو شێوەیە لایەنەكەی دیكە لەوپەڕی تەركیزدایە و هەستدەكات بابەتێكی زۆر گرنگ هەیە كە باسەكە بەئاڕاستەیەكدا بگۆڕێت.

# جۆری دووەم

## بیردۆزی "هەروەها منیش"

باسی هەر شتێک بکرێ دەبینین هاوڕێکەمان دەڵێت: "بەسەر منیش هاتووە" , ئینجا دەستدەکات بە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆی بێ ئەوە بیربکاتەوە کەسی قسەکەر هێشتا تەواو نەبووە لە قسەکانی.

کەسانی وا هەن تەنها بایەخ بە باسکردنی ئەزموونی خۆیان و کەسە نزیەکەکانیان دەدەن، بایەخ بە هیچی دیکە نادەن. بەو هۆیەشەوە هەرکەسێک قسەبکات لەسەر حسابی ئەوان دەستدەکات بە باسکردنی خۆی و خۆشەویستەکانی.

بۆ نموونە ئەگەر کەسێک بڵێ: " شتێکی زۆر سەیر ڕوویدا.." پێش ئەوەی بهێڵێ ئەو قسەکەی تەواوبکات یان بزانێ چی بووە ڕاستەوخۆ دەڵێت: " لەوە سەیرتر نییە کە بەسەرمندا هاتووە، ....." پاشان دەستدەکات بەئەشکەنجەدانی قسەکەر، دەستدەکات بە گێڕانەوەی باسەکە بێ ئەوەی گوێگری ڕاستەقینە هەبێت گوێی بۆ ڕاگرێت، بەڵام خۆ سووربوونی لەسەر هەڵوێستەکەی گەورەترین پێشبڕکێیە بۆی.

ئەگەر یەکێ پێیان بڵێت: " بەخوا براکەم ئەم دوو ڕۆژە پشتم کەمێ ئازاری هەیە"، یەکسەر چاوەکانی دادەخات بۆ ئەوەی گوزارشت لەزۆری ئازارەکەی بکات: " هەموو شتێک تەنها ئەو ئازارە نا کە بەمنەوەیە، پشتی تۆیی چی، هەفتەی ڕابردوو هەر مردم مرد"، دیسان دەستدەکاتەوە بە چیرۆک گێڕانەوەی خۆی، ئینجا ئەشکەنجەدانی دەروونی دەستپێدەکات، بەڵێ ئەشکەنجەدانی ئەو گوێگرەی کە پێشتر قسەکەربوو!!

ئەم جۆرە کەسانە هەرزوو هاوڕێکانیان لەدەستدەدەن، کێ هەیە لەم دنیایەدا هاوڕێیەتی کەسێک بکات کە گوێ لە دەردە دڵییەکانی نەگرێت و تەنها بایەخ بەخۆی بدات!

هەندێ کات ڕەنگە لەترسی ئیرەیی بردن بێت، پێی وایە ئەگەر هاوسێکەی وتی کە بەدەس نەخۆشییەکەوە دەناڵێنێ و ئەویش لەوپەڕی تەندروستی بێت ئەوا بەدڵنیاییەوە هاوسێکەی ئیرەیی پێدەبات. هەر بۆیە دەستدەکات بە ناڕەحەتی دەربڕینی خۆی کە لە هی هاوسێکەی زیاترە. بێگومان دەرئەنجامی ئەمە لەکۆتییدا بێجگە لە متمانە لەدەستدان و غیرە و ڕقلێبوونەوە زیاتر هیچی دیکە نییە.

ئەو کەسەی بەردەوام ناڕەحەتی پیشاندەدات لەڕاستیدا زۆر دوورە لە هونەری ئاخاوتن. ئاساییە ئەگەر جار جار مرۆڤ باسی

نارەحتی و دەردە دڵی خۆی بکات بۆ کەسە نزیکەکانی بە مەبەستی خۆ خاڵیکردنەوە یان ڕاوێژکردن پێیان، بەڵام بەردەوامبوون لەسەر ئەم خووە مەترسیدارە.

کارەساتەکە گەورەتر دەبێت کاتێک ئەم نارەحەتی پیشاندانە هاوکات بێت لەگەڵ چاوەڕوانی کردن لە کەسەکە کە گوێگربێت، پاشان دڵی ئەو کەسە لەدەستبدات کە ویستویەتی قسەی بۆ بکات، بەتێپەڕبوونی کاتیش کەسێک نابینێتەوە بەڕاستی خۆشی بوێت، دوای دەستدەکات بە بۆڵەکردن گوایە ژیان گۆڕاوە و کەسی بەوەفا کەم بۆتەوە. ڕاستی خودی خۆی هۆکاری ئەوانەیە، چونکە کەسێکی زۆربڵێ بووە و قسەی بەوانی دیکە بڕیوە لەپێناو باسکردنی ئەزموون و هەڵوێستە دووبارەکانی ژیانی خۆی!!

هەموو مرۆڤێک زیاتر ئەزموونەکانی خۆی دەبینێت وەک لە ئەوانی تر، ئەمەش لەبەر ئەوەیە خۆی بەو ئەزموونەدا تێدەپەڕێ. هەمیشە مرۆڤ دەیەوێت هەستەکانی بگەیەنێتە ئەو کەسەی لەگەڵی قسەدەکات بەو جۆرەی کە هەستی پێدەکات، بەڵام ئەمە ئەستەمە. ڕەنگە ڕووی دابێت کەسێک وەسفی شوێنێکی بۆ کردبی کە هەرچۆنێک بووە ئەبێت سەردانی ئەو شوێنە بکەیت، چونکە شوێنێکی زۆر سەرەنجڕاکێش و نایابە،

بەڵام کاتێک دەچیت و دەبینی شوێنەکە بەو جۆرە نییە کە هاوڕێکەت بۆی باسکردووی و زۆر شوێنێکی ئاساییە بەڵکو هیچ خۆش نییە. ئەوەی لێرە ڕویداوە ئەوەیە هاوڕێکەت باسی هەستی خۆی بۆ کردووی لەو شوێنەدا، بەڵام لەکاتی قسەکردن نەیتوانیوە هەستەکانی خۆی و واقعی ئەو شوێنە لێک جیابکاتەوە.

ئەو کەسەش کە بەردەوام دەڵێت "هەروەها منیش" و "بۆ منیش هاتۆتە پێش" باسی هەر تاقیکردنەوەک بکەی لەبەردەمیدا، لەسەر بنەمای هەستەکانی خۆی هەڵسەنگاندنی بۆ دەکات و نرخ بۆ هەست و سۆزی خۆی دادەنێت لەبارەی ئەو هەڵوێستەوە. هەر بۆیە بەراورد دەکات لەنێوان ئەو ڕووداوەی بەسەر خۆی یان خزم و کەسەکانی هاتووە لەگەڵ ئەوەی بەسەر تۆشدا هاتووە، کاتێک دەبینێت کاردانەوە و هەست و سۆزی زیاتری هەیە بۆ ئەوەی خۆی وا هەستدەکات ئەو ڕووداوەی بەسەر ئەودا هاتووە لەهی کەسی بەرامبەر سەختتر و ناخۆشتر بووە. هەر بۆیە ناتوانێ واقیع و هەستەکانی خۆی جیابکاتەوە ئەگەر لێشی بپرسی چۆن ئەوەی ئەو ناخۆشتر بووە ئەوا زۆر بەجوانی بۆت ڕوندەکاتەوە.

لێرە بەدواوە یەکێ لە گرنگترین هۆکارەکانی بیردۆزی "هەروەها منیش" مان بۆ دەردەکەوێ..

ئەگەر کەسێک باسی بابەتێکی هاوشێوەی ئەوەی کرد کە بەسەر ئێمەشدا هاتبوو ویستمان قسەکەی پێ ببڕین و باسی ئەوەی خۆمان بکەین پێویستە سەرەتا کەمێک بیربکەینەوە و لەخۆمان بپرسین:

١. ئایا ئەوەی بەسەر مندا هاتووە لەوەی کەسی بەرامبەر ئەستەم و ناڕەحەتتر بووە؟ یاخود تەنها من ئەو هەستەم هەیە بۆی؟

٢. ئایا ئەو باسەی قسەی لەسەر دەکەم بەڕاستی چێژبەخشە بۆ کەسی بەرامبەر یاخود تەنها من واهەستدەکەم؟

٣. ئایا بۆ خۆسەپاندن قسەدەکەم یان بەڕاستی کەسی بەرامبەر دەیەوێت گوێم لێبگرێت؟

ئەمانە چەند پرسیارێکن یارمەتیت دەدات بڕیارێکی ژیرانە بدەی ئاخۆ قسە بە کەسی بەرامبەر ببڕی یان نا؟ کاتێک باسی ڕووداوێک دەکەیت کە بۆت هاتۆتە پێش، ئەم پرسیارانە و پرسیاری هاوشێوەی یارمەتیت دەدەن تاوەکو بابەتەکە هەڵبسەنگێنی پێش ئەوەی باس لە هەر بابەتێکی دیکە بکەیت.

# جۆری سێیەم

## قسە پێ برین بە مەبەستی بەرهەڵستی

کەسێک بیروڕای خۆی دەخاتەڕوو لەبارەی بابەتێکەوە، بەڵام تۆ بەهیچ شێوەیەک هاوڕانیت لەگەڵی، قسەکەر ڕەنگە تەنانەت هەندێ ڕاستی و زانیاری هەڵە باسبکات، تۆش پێت وابێت ئەگەر ئاگاداری بکەیتەوە لەبارەی ڕاستییەکانەوە ئەوا قسەکەر دەستبەجێ بیروڕای دەگۆڕێ. ڕەنگە ناڕازی بیت بە بۆچوونەکانی تەنها لەبەر ئەوەی هەمان عەقیدە و بیروبڕوای تۆی نییە، بۆ نموونە: "من دەزانم ئەمە حەرامە، ناشمەوێ هیچ شتێکی دیکە لەو بارەیەوە ببیستم"

ئەم جۆرە قسە پێ بڕینە زۆر کوشندەیە و پەیوەندییەکان لەناودەبات، کەسایەتی کەسی قسە پێ بڕیش لەسەر کارەکەی بێت، لەناو خێزان، یان لەلای هاوڕێکانی ناشرین دەکات لەناو کۆمەڵگە،. چونکە ئەو ڕەفتارە وادەکات ئەوانی دیکە وا بیربکەنەوە کە کەسێکی نائارام و بێزارکەرە.

ئەگەر هۆکارەکەی تەنها ئەوە بێت کە لەگەڵ بۆچوونەکەی هاوڕا نەبم، دانایییە کە چاوەڕێبم تاوەکو قسەکانی تەواو دەکات پاشان منیش بیروبۆچوونی خۆم ڕونبکەمەوە و بیخەمەڕوو..

بەویستی خوای گەورە لە دواتردا ئەوە دەخەینەڕوو چۆن جیاوازی بیروبۆچوونی خۆمان دەربڕین بەڕێگەی شیاو و بەرهەمدار.. بەڵام لێرەدا باسی گرنگی قسە پێ نەبڕین دەکەین، تەنها لەکاتی زۆر پێویست و ناڕەحەتتدا نەبێت..

ئەگەر هۆکاری پچڕاندنەکە تەنها بۆ بەبیرهێنانەوەی قسەکەربێت بەشتێک ئەگەر بیزانێت بیروڕای دەگۆڕێ، ئەوا باشترە کە بەپێی توانا چاوەڕێی بیت تاوەکو قسەکانی تەواو دەکات، دەکرێت مۆڵەتی لێوەربگری و ئەو زانیارییەی وەبیربێنیتەوە، ئەگەر لەوپەڕی نائارامیدا بوویت، ئەوا دەبێت زانیارییەکە زۆر بەخێرایی و بەکورتی بیڵێیت و بێدەنگ بیت. چونکە جیاوازی هەیە لەنێوان سەرەنجێکی بەپەلە و گفتوگۆیەکی درێژ...

بۆنموونە

کەسێک دەڵێت: ئاااە ئەم عەباس عەقادە .....؟؟

کەسی دووەم قسەکەی پێ دەبڕێت: " ئاااای بەڕاستی نووسەرێکی زۆر لێهاتووە، کتێبەکانیم خوێندۆتەوە..."

کەسی یەکەم قسەکەی پێ دەبڕێت: " نەخێر، ببورە مەبستم شەقامە، شەقامی عەباس عەقادە لە شاری نەسر، نووسەر نییە، ویستم بڵێم عباس عەقاد زۆر قەرەباڵغە"

ئەم جۆرە قسە پێ بڕینەیان ڕێگە پێدراوە و بەڵکو پێویستیشە، لەبەرئەوەی ئەگەر لێی گەرابا قسەکانی درێژە پێ بدات ئەوا بەردەوام دەبوو لە قسەکردن لەبارەی ئەو نووسەرە، دواتر وای دەزانی مەبەستی بووە گاڵتەی پێبکات ئەگەر نا ئەو هەموو ماوەیە لێ نەدەگەڕا باسی ئەو نووسەرە بکات.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەبێت گوێ لە قسەکەر بگیرێت تاوەکو کۆتا وشە و ڕستەی واتادار کە دەری دەبڕێت، چونکە ئەوە یەکێکە لە ڕەوشتەکانی ئاخاوتن. هەروەها هەلێکی باشە بۆ گوێگر کە بەجوانی بیر لە وتەکانی کەسی بەرامبەر بکاتەوە، تاوەکو هەموو ئەو لایەنانەی بۆ بەدیارکەوێ کە لەگەڵی هاوڕایە. هەروەها پێشنیار دەکرێ کە بە شێوازێکی جوان پرسیار بکەی بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ قسەکانی تەواو بوونە یاخود خاڵی دیکە ماوە ڕوونکردنەوەی لەسەر بدات. لەدوای ئەوە ئەگەر کەسی قسەکەر تەواوبوو دەتوانی دەست بکەیت بە شیکردنەوە و بیروبۆچوونی خۆت لەسەر بنەمایەکی تەندروست؛ لێرەدا تۆ گوێبیستی قسەکانی کەسی یەکەم بوویی بەتەواوی. هەندێ کەس هەن سیفەتێکی زۆر جوانیان هەیە، بریتییە لە بابەتی بوون کاتێک گوێ لەوانی دیکە دەگرن تاوەکو کۆتای، ڕەنگە تێڕوانینی بگۆڕێت، چونکە هەلێکیان بەخۆیان بەخشیوە کە

گوێ بگرن، وە هەلی تەواوەتیشیان داوە بە کەسی بەرامبەر کە بەشێوەیەکی زۆر جوان تێڕوانیی خۆی بخاتەڕوو.

تەنانەت ئەگەر بابەتەکە پەیوەندی بە بیروباوەڕی ئایینی یان هەر بابەتێکی هەستیارەوە هەبێت; لەسەرخۆبوون باشترین شتە، جوان گوێگرتنیش هەمیشە لەبەرژەوەندی خاوەنەکەیەتی. ئەو کەسەی ئایین و وڵاتەکەی خۆش دەوێت نابێت شکۆی خۆی لەدەستبدات و دەنگ بەرز بکاتەوە. بیروباوەڕێکی گشتی هەیە دەڵێت: ئەگەر بابەتەکە پەیوەندی بە ئایینەوە هەبوو دەبێت مشتومڕ بکەیت.

ڕوونە کە جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی ئارامگری لەسەر بەڵاو موسیبەت بێت لە پێناو ئایین دەکرێ، نابێت کە دەنگ بەرزکردنەوەو بێ ڕێزی و هێرشکردنە سەر لایەنی بەرامبەری لەگەڵدا بێت.

هەرچەندە مرۆڤ ئارام و لەسەرخۆبێت ئەوەندە هەڵوێستی بەهێزتر دەبێت، بەم شێوەیە نابێت کە هەندێ لە بەرنامە تەلەڤیزۆنییەکان پەخشی دەکەن لەپێناو زیادکردنی ڕێژەی بینەرەکانیان، ڕەنگە ڕێژەی بینەرەکان زیاد بکات، بەڵام لە نرخ و ڕێزی ئەو دوو کەسە کەم دەکاتەوە کە دەمەتەقێ دەکەن

وەکو کەڵەشێر شەڕ دەکەن و خاوەنی بەرنامەکان تەنها بۆ سەرەنجڕاکێشانی بینەرەکانیانە و هیچی تر.

هەرگیز پێت وانەبێ ئەو کەسەی لەبەرامبەرتدا قسە و گاڵتە بە دین و پێغەمبەر و وڵات و جۆری کارەکەت دەکات، ئەگەر قسەکانی پێ ببڕی ئەوا ئەنجامێک بەدەستد دەهێنی، بەڵکو بیربکەوە بۆچی ئەم کەسە بەو شێوەیە بیردەکاتەوە، ئایا مەبەستی ئەوەیە دەماری منی پێ بگرێت؟ یا لەپێناو بەدەستهێنانی بەرژەوەندی کەسی وادەکات؟ یان بەڕاستی بۆچوونەکەی بنەمایەکی جێگیری هەیە لەناخیدا؟

ئەگەر دڵنیابوویتەوە لەوەی کەسی بەرامبەر پێچەوانەی ویژدانی خۆی دەجوڵێتەوە و ئامانجی ئەوەیە تۆ بوروژێنێت، ئەوە موناقەشەکردن لەگەڵی هیچ سودێکی نابێت، چونکە ڕاستی دەزانێت و هیچ پێویست ناکات تۆ ڕوونکردنەوەی پێبدەیت. لەم حاڵەتەدا دەکرێ مۆڵەت بخوازی تاوەکو بابەتەکە بگۆڕیت یان بە بێدەنگی دانیشتنەکە جێبهێڵیت، چونکە ئەوە باشترین سزایە بۆ موناقەشەکارێکی نیەت خراپ، کە تەنها حەزی بە دەمەتەقێیە.

بەڵام ئەگەر لەبنەڕەتدا بیروبۆچوونی بەم شێوەیە بوو ئامانجی وروژاندی تۆ نەبوو، ئەوا بزانە باشترین ڕێگە ئەوەیە زۆر

گوێبگریت و کەم قسە بکەیت. ئەمەش وائەکات کەسی بەرامبەر هەستێکی قوڵی لا دروست بێت کە تۆ باوەڕی تەواوت هەیە بەوەی دەیڵێت، کەسێکی بیروباوەڕ جێگیری لەبارەی ئەوەی کە ئەو باسی لێوەدەکات.

❊❊❊

# جۆری چوارەمیش

## سەیرترین جۆری قسە پێ بڕینە:

## قسە پێ بڕین بۆ پیشاندانی ڕەزامەندی

کەسی وا هەیە ناهێڵێت قسەکەت تەواو بکەیت و بۆت تەواو دەکات، لەبەر ئەوەی زۆر بەپەرۆشە بۆ ئەوەی باسی دەکەی، ڕەنگە بیەوێ بیسەلمێنێ کە ئەویش زانیاری لەوبارەیەوە هەیە و تۆش هیچی نوێت بەلای ئەوەو باسنەکردووە، چونکە ئەو لە بنەڕەتدا زۆر بەباشی ئەو بابەتە دەزانێت...

کەسی واش هەیە قسەکەت بۆ تەواو دەکات تاوەکو لە قسەکردن بووەستی، لەبەر ئەوەی بێزارە لەو باسە، یان ڕەنگە بیەوێ خۆی دەستبکات بەقسە، هەر بۆیە زۆربەی کات دەبینی چۆن ئەو قسە پێ بڕە بە پەرۆشانە باسەکە دەگۆڕن بۆ باسێکی تر دوور لە بابەتە ئەسڵییەکەی سەرەتا.

بۆ نموونە:

- کەسی یەکەم: " من ڕۆژانی هەینی بەردەوام..."

- کەسی دووەم کە قسەکەی پێ دەبڕێت: نەڵێی کە لە مزگەوتی نور نوێژ دەکەی، مزگەوتێکی زۆر باشە، الله.... یانی تۆش لەوێ دەژیت؟ کەواتە ئێمە هاوسێی یەکترین"

ـ كەسی یەكەم: " نەخێر، لەڕاستیدا هەر نوێژ ناكەم، بۆ زانیاریت من مەسیحیم، دەمویست بڵێم هەمیشە ڕۆژانی هەینی دەچ م..."

كەسی قسەپێ بڕ: بەڵێ بەڵێ.. باشە... ئەچی بۆ سەردانی دایكت.. باشە، بەڕاستی دایك خۆشەویستی دڵانە، والله كارێكی باش دەكەیت، خوای گەورە تەمەن درژی بكات بۆت"

ـ كەسی یەكەم ئەقڵی لەدەس ئەدات: ئەرێ براكەم كەمێ بەزەیت پێمدا بێتەوە، دەستت ماچدەكەم بێڵە با قسەكەم تەواو بكەم، دەمەوێ بڵێم هەموو ڕۆژانی هەینی زوو دەچمە سەركار، ئەمڕۆش پێنچ شەممەیە و كات درەنگی كردووە دەبێت بڕۆم ئەگەر نا بەیانی زوو خەبەرم نابێتەوە، هەر بۆیە دەبێت ئێستا بڕۆم، تۆش لەو كاتەوە ڕاتگرتووم... خوات لەگەڵ"

بەم شێوەیە، بەهۆی بەپەرۆشبوونیەوە قسەكە دەبڕێ و هەلی ناداتێ تاوەكو ڕوونكردنەوە بدات، ئاواش هەم كات و ئاخاوتن هەم مەبەستی گفتوگۆكردن لەناو دەبات بەگشتی.

زۆربەی كات ئەوانەی قسە بەكەسانی دیكە دەبڕن، ئەوانەن هیچ بایەخ نادەن بە بابەتەكە یان دژایتی بابەتەكە دەكەن، یان مونافسەی گفتوگۆكار یان یەكێ لە گوێگرەكان دەكات، تەنها

بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ شارەزایی تەواوی هەیە لەو بارەیەوە ناهێڵێت قسەکە تەواو بکات. .

ئەگەر کەسێک باسی هەر شتێک بکات پەیوەندی بە وڵاتە ئەوروپییەکانەوە هەبێت، باسی چێشتخانەیەک، یان هۆتێلێکی بەناوبانگ بکات، دەبینی زۆر ئەستەمە بۆ ئەوانەی قسە پێ بڕن بە بێدەنگی دانیشن و هیچ سەرنجێکیان نەبێت، کە هیچ پێویستیش نییە..

بۆنموونە:

- قسەکەر: بەڕاستی لەهەموو شوێنیک قەرەباڵغی ڕێگاوبان هەیە تەنها لە میسرِ بەوشێوەیە نییە.."

- کەسی قسە پێ بڕ: بەڵێ مەبستت Rush Hour ە

( ئەمەش ئاماژەیەکە تاوەکو دەری بخات کە واتای ئەو وشەیە بە ئینگلیزی دەزانێت).

- قسەکەر: تەنانەت لە پاریسیش بەو شێوەیەیە، لە شانزیلیزیش سەعات پێنچ ڕێگاوبان زۆر قەرەباڵغە.

- قسە پێ بڕ: ئای خوایە پاریس، واللە ئەو ڕۆژانەت بیرهێنامەوە کە لەوێ بووم، بەخوا شاری ڕووناکییە"

(ئەمەش ئامازەیەكی دیكەیە تاوەكو بە هاورێكەی بڵێت چۆتە ئەوێ، و یادگاری هەیە تێیدا).

(دەتوانی تێبینی بكەیت كە هەموو سەرەنج و پچڕاندنەكانی هیچی گرنگ نین، تەنها بۆ خۆدەرخستن و سەلماندنی زانایی و خۆ بەرزكردنەوە نەبێت هیچی تر نییە، بەڵكو بە پێچەوانەوە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر نەزانی و ئاست نزمی.)

❊❊❊

# جۆری پێنجەم

## قسە پێ برین بەئامانجی گاڵتە پێکردن، (القافیه تحکم)

هەرکات باسی شتێک بکەی کەسەکەی تر ناهێڵێ بەرودەوام بێت و نوکتەیەکی بێ تام دەگێڕێتەوە، پێی وایە دەبێت قسەکە بەتۆ ببڕێ و لەو کاتەدا بیڵێت ئەگەر نا نوکتەکەی ئەو کاریگەرییەی نامێنێت. ڕەنگە تۆ باسی بابەتێکی گرنگ بکەیت، یان باسێک بێت پێویستی بە تەرکیزکردن بێت، بەڵام هاوڕێکەمان هیچی بەلاوە گرنگ نییە تەنها رووح سووکی خۆی و خێرا دەربڕینی سەرەنجە هەزەلییەکەی نەبێت. هەر بەهۆی ئەمەوە ئاخاوتنەکە گەرم و گوڕییەکەی نامێنێت. وا دەکات ئامادەبووانیش لەو کەسە خۆیان بەدووربگرن.

بۆنموونە:

کەسی یەکەم: "دارتاشێکی باش ناناسی؟"

کەسی دووەم (ڕوخۆشەکە): بۆچی کوڕی باوکم؟ دارتاشی برام دەرگاکەت لێ بۆتەوە؟ ... هاهاها"

کەسی یەکەم: بە من ئەڵێی دارتاش؟ بەجددیمە دارتاشێک ناناسی؟ دەرگای مەتبەخەکەم کەمێک پێویستی بە چاککردنە

وماڵێک هەن دەیانەوێ دووسبەی بێن سەیری خانووەکە بکەن بۆ ئەوەی بەکرێی بگرن"

ڕوخۆشەکە: ئاسانە، پارەی کرێکەیان وردە لێوەرمەگرە لەبەر ئەوەی دەرگای مەتبەخەکە بەوشێوەیەیە، بەمجۆرە هەردوولا وەک یەک دەبن... هاهاها"

کەسی یەکەم: وەڵا تۆ جەوت هەیە، گاڵتەناکەم، بابەتەکە گرنگە بۆ من، کەس دەناسی یان نا؟

ڕوخۆشەکە: کاکە ئەگەر کەسیش نەناسم دەتوانم یەکێ هەر ببینەمە و بیناسم، بەس سەرەتا پێویستە یەکتربناسین و دواتر ڕاستەوخۆ مارەی دەکەم هاهاها..." کەسێکی نوێژکەر و لەخێزانێکی پارێزکاریشم، هاهاها..."

بێگومان هیچ سەرەنجێکی دیکە ناوترێ

زۆربەمان ڕووبەڕوی ئەم کەسە هەزەلییە دەبینەوە

خوای گەورەش بەهانای ئەو کەسەوە بێت کە دەکەوێتە ژێر دەستی ئەم جۆرە کەسانەوە. سڵاو لەوەش بەڕێوەبەرەکەی بەوشێوەیە بێت و کاری لەگەڵ بکات، یان باوکی بووک بێت و زاوا ناچار بێت خۆی بخواتەوە و بەرگەی ئەو جۆرە قسە پێ برین و سەرەنجە سەیر و سەمەرانە بگرێت.

ئەوەی بۆ من بایەخی هەیە ئەی خوێنەری خۆشەویست تەنها تەرکیزی تۆیە، هەوڵبدە تۆ لەو قسە پێ برە ڕوخۆشانە نەبیت!

هیچ ڕێگرییەک نییە لەوەی هەندێ کات قسەی خۆش بکەیت کە سروشتێکی پێکەنیناوی هەبێت، بەڵام دەبێت سەرەتا بەخۆماندا بچینەوە.

پوختەی قسە پێ بڕین:

قسە پێ بڕین، زۆربەی کات بەقازانجی خاوەنەکەیدا ناشکێتەوە، بۆیە پێشنیار ناکرێ تەنها لە باردۆخێکی زۆر ئەستەمدا نەبێت، دەبێت زۆر بەکورتی دەرببڕدرێت و زۆر بەخێرایی بوترێت. دەبێت نەهێڵین بەو سیفەتە بناسرێین لەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین، ئەگەر نا لەدەستدانێکی کۆمەڵایەتی گەورەیە و بەئاسانی قەرەبوو ناکرێتەوە.

گرنگترین هۆکارەکانی قسە پێ بڕین بریتییە لە:

- - قسەبڕین بەهۆی بایەخ نەدان بە قسەکەر و ئەو بابەتەی باسی دەکات
- - بیردۆزی "هەروەها منیش"
- - قسە پێ بڕین بە مەبەستی بەرهەڵستی:
- - قسە پێ بڕین بۆ پیشاندانی ڕەزامەندی

- ـ قسە پێ بڕین بەئامانجی گاڵتە پێکردن.

لەمەوبەدوا پێ دەنێینە نێوئەو بابەتەی کە بە جیاکەرەوەی هەرمرۆڤ دادەنرێت لە هونەری ئاخاوتندا. کەوابوو بابڕۆین بۆ دەگای داهاتوو...

❊❊❊

# جیاوازی نێوان مشتومڕ لەگەڵ وتووێژ

بەڵێ هەردووکیان جیاوازن، زۆربەی خەڵکی لەکۆمەڵگەی عەرەبیدا جیاوازی لە نێوان وتووێژ و مشتومڕ ناکەن، ئەمەش هۆکاری زۆربەی کێشەکانمانە لەکاتی ئاخاوتندا.

(وتووێژ: بریتییە لە گفتوگۆ و ئاخاوتنێکی تەندروست لەنێوان هەردوولا دەربارەی بابەتێک یان زیاتر، مەرج نییە کەسەکان کۆک بن لەسەر هەمان تێڕوانین، بەڵام ئەوەی کۆیان دەکاتەوە ئامانجی گفتوگۆکارەکانە کە بگەنە ڕاستی، یاخود ڕەنگە تەنها ئاخاوتێکی ئاسایی بێت.)

(لەکاتێکدا مشتومڕ: دەستەواژەیەکە بەکاردێ بۆ وەسفکردنی قسەکردنی نێوان دوو کەس یان زیاتر کە توندووتیژی و هێرشکردنە سەر لایەنی بەرامبەری تێدایە، لە کۆمەڵگەی ئێمەشدا ئامانج لە مشتومڕ گەیشتن نییە بە ڕاستی بابەتەکە، بەڵکو بۆ خۆسەپاندن یان ئەوەی تەنها بیروبۆچوونی خۆی زاڵبکات..)

ئەمە واتا چییە؟

واتا، ووتوێژکردن قسەی چەند کەسێکە لەبارەی بابەتێکی دیاریکراو و هەردوولا پێکەوە بیردەکەنەوە تاوەکو بگەنە ڕاستی.

مشتومڕیش: هێرشکردنە سەر کەسانی دیکەیە تاوەکو کەسی مشتومڕکار براوەبێت، تەنها بردنەوەی خۆی بەلاوە گرنگە. هیچ بایەخێک نادرێ بە گەشتن بەڕاستی.

کاتێک دەڵێیت "وتوویژ" ئەو هەستەت بۆ پەیدا دەبێت کە هەردوولا هاوبەشی دەکەن لەگەشتن بەڕاستیدا، یان دۆزینەوەی چارەسەرێک بۆ ئەو شتەی لەبارەیەوە دەدوێن، بێ ئەوەی گرنگی بدرێت بە دەرئەنجامی وتوێژەکە؛ لایەنە گفتوگۆکارەکانی کاتێک کۆتایی بەقسەکانیان دێت ڕقیان لەیەکدی نابێتەوە، بەپێچەوانەی مشتومڕکارەکان.

لەخوارەوە باسی گرنگترین جیاوازییەکانی نێوان وتوویژ و مشتومڕ دەکەین:

١. ڕووبەڕووبوونەوە/ بەرپەچدانەوە:

لە مشتومڕدا دەبینین کەسی قسەکەر ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی بیروبۆچوونی لایەنی بەرامبەر دەبێتەوە، لەکاتێکدا لە وتووێژکردندا هەردوولا دەگەڕێن بەشوێن خاڵی هاوبەشی نێوانیان و خستنەڕووی ئەو خاڵانە، دواتر لەو خاڵە هاوبەشانەوە بیروبۆچوونی خۆیان دەردەبڕن.

ڕووبەڕووبوونەوەش دیارترین خاڵە کە مشتومڕ و وتووێژ لەیەکتر جیادەکاتەوە، ئەگەر بینیمان ڕووبەڕووی هەرشتێک دەبینەوە کە لایەنی بەرامبەر باسی دەکات و ئێمەش چی ئەو بیڵێ ڕاستەوخۆ پێچەوانەکەی بڵێین، ئەوا دەبێت بزانین کە کەوتوینەتە سەر ڕێگەی مشتومڕ نەوەک وتووێژ، بێگومان دەبێت ئاوازی قسەکردنەکانمان بگۆڕین و ڕاستەوخۆ بەشوێن خاڵێ هاوبەشدا بگەڕێین کە هەردووکمان کۆک بین لەسەری.

هەندێ دەستەواژە هەن بێ ئەوەی هەستی پێ بکەین زۆر بەکاری دەهێنین لەکاتی وتووێژکردندا، ڕەنگە ببێتە هۆی گۆڕینی وتووێژ بۆ مشتومڕ , لەوانە:

(هەڵەیە..... ڕاست نییە...... بەپێچەوانەوە).

مشتومڕیش زۆربەی کات لەسەرەتادا لەسەر شێوەی وەڵامدانەوەی خێرایە بەبەکاهێنانی ئەم دەستەواژانە لەدژی لایەنەکەی دیکە.

بۆنموونە:

یەکێک دەڵێت: پێم وایە حکومەت کاری باشیکردووە، مەبەستم ئەوەیە هێندەش خراپ نییە کە خەڵکی باسی لێوە دەکات.

لایەنی بەرامبەریش ڕاستەوخۆ وەڵام دەداتەوە: ڕاست نییە.. تۆ چۆن شتی وا دەڵێی؟.. بەپێچەوانەوە، ئەوان وێرانەیان ناوەتەوە، واللە پێدەچێ تۆ ئاگاداری هیچ شتێ نەبیت!!

ئەوەی لێرە ڕوویدا خێرا وەڵامدانەوەی لایەنی بەرامبەرە بە دەستەواژەی " ڕاست نییە، هەڵەیە، یان دەستەواژەی بەپێچەوانەوە" لەدەستپێکی قسەکردنەکەیدا کە ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی بابەتەکە لە گشتیەوە بگۆڕێ بۆ کەسی؛ چونکە زۆر بەڕوونی بەکەسی بەرامبەر دەڵێت ئەوەی تۆ بیری لێ دەکەیتەوە راست نییە، هەڵەیە، بۆچوونی من پێچەوانەی بیروبۆچوونی تۆیە.

زۆربەی کات ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانی ئاڕاستەی گفتوگۆکان بەرەوە هەستی تۆڵەسەندنەوەی کەسی، "یانی تۆ دەڵێی ئەوەی من وتوومە هەڵەیە؟ ئەی بۆ پێت چۆنە خۆت هەڵە بیت و لەهیچیش تێ نەگەشتبی؟"

بەل شێوەیە مشتومڕ پەیدا دەبێت تەنها لەپێناو سەلماندنی ڕاستی بیروبۆچوونی یەکیان بەسەر ئەوی تریان کە زۆر دووردەکەونەوە لە بابەتە سەرەکییەکە. لەم نموونەیەدا هەڵسانگاندن دەکرێ بۆ کارەکانی حکومەت بەڵام ڕەنگە ئاڕاستەی "من" و "تۆ" وەرگرێ، هەر لەبەر ئەوەشە کە

ناکۆکییەکان، ڕق لێبوونەوە و پێشبرکێکە زیاد دەکات. لەکاتێکدا ئاهەنگ بۆ نەزانی دەگێڕێ و چاوەڕێی ڕاستی دەکات "هەموو ساڵێکت بەخۆشی بێ" ، ناگەین بەهیچ ئەنجامێکی جوان، سەرەتاکەی ئەم مشتومڕە بێت.

هیچ عەیبە نییە تێڕوانینمان جیاواز بێت، بەڵام کێشە ئەوەیە تێڕوانینەکان بەجۆرێک بخەینەڕوو لەسەر بنەمای دووژمنایەتی و ڕق لێ بوونەوە بێت.

کەسێک پێتی وت حکومەت باش کار دەکات، تۆش ئاگاداری ئەوە نیت، ئەوە شەرم نییە، واتای ئەوەش نییە ئێوە دوژمنی یەکترین، بەڵام باشترە هەوڵبدەی ئەو هۆکارو پاڵنەرانە بزانی کە بوونەتە هۆی ئەوەی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەیی هەبێت. بزانە خۆی یان خزمێکی نزیکی ئەندامێکی باڵا نییە لە حکومەت؟ لەو حاڵەتەدا دەبێت شێوازی ئاخاوتنەکە جیاواز بێت؛ چونکە لەم حاڵەتەدا بابەتەکە گشتی نییە، بەڵکو تایبەتە بە لایەنی بەرامبەر خۆی یان باوکی، هەربۆیە ڕەچاوی باردۆخەکە دەکات و هەندێ دەستەواژە بەکارناهێنێت کە ڕەنگە تۆش حەزنەکەی خەڵکی لەدژی تۆش بەکارییان بهێنێ کاتێک ڕەخنەت لێدەگرن...

بەڵام ئەگەر کەسەکە بێ لایەن بوو، نە سەلکی سیر نەقنچکی پیاز نەبوو لەم حکومەتەدا، ئەوا تەنها بیروبۆچوونی خۆیەتی و بابەتەکە گشتییە، هەر بۆیە هێرش ناکەمە سەر خۆی و قسەکانی، بەڵام دەست دەکەم بە خستنەڕووی ئەو ڕاستییانەی دەتوانێت بڕوای لەسەر دابمەزرێنێ، لێرەدا دەبێت پرسیاری لێ بکرێت:

"باشە، چی شتێک وا دەکات ئاوا بیربکەیتەوە؟ .. بەدڵنیاییەوە هۆکاری خۆت هەیە تاوەکو بەم شێوەیە بیربکەیتەوە؟ چین ئەو هۆکارانە؟"

کاتێک کە وەڵام دەداتەوە، دەتوانی دەستبکەیت بە لێکدانەوەی قسەکانی یەک بە یەک زۆر بە وردی، ئەو کات دەتوانی تێڕوانینی خۆتی بخەیتە پێش چاو تاوەکو بەراوردی بکات بە هۆکارەکانی خۆی. ڕەنگە بتوانی قەناعەتی پێ بهێنی یان ئەو بتوانێ تۆ بباتە سەر بۆچوونەکەی خۆی، تەنانەت ئەگەر کەستان ڕازی نەبوون بە بۆچوونی ئەوی دیکەتان بابەتەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە و تەنها پەیوەندی بە حکومەتەوە دەبێت کە کارەکانی باش یان خراپ بەڕێوە دەبات. هیچ پەیوەندی بە من و تۆوە نابێت.

دەبێت خۆمان بپارێزین لە بەکارهێنانی دەستەواژە ورووژێنەرەکان لەدەستپێکی قسەکردندا، تەنها لە باروودۆخێکی زۆر پێویستدا نەبێ بەکارییان نەهێنین، لەوانە:

(نەخێر............بەڵام............ بەوشێوەیە نییە)

مەرج نییە ئەو کەسەی لەدەستپێکی قسەکانیدا ئەو دەستەواژانە بەکاردێنێ پێچەوانەی تۆ بیربکاتەوە، بەڵام دەکرێ تەنها خووی گرتبێ بە بەکارهێنانی کاتێک دەست بەقسە دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەسی بەرامبەر وا هەست بکا بیرکردنەوەکەت لەدژی ئەوبێت، لەکاتێکدا هیچ ناکۆکییەک بوونی نییە و هەمان تێڕوانینیان هەیە، بەڵام بەهۆی بەکارهێنانی یەکێ لەو دەستەواژە ورووژێنەرە هاندەرانە بۆ جیاوازی ئەو هەستەی لەلا پەیدا دەبێت.

بۆنموونە:

- بەکەسێک دەڵێی: والله زۆر باش کێشت کەمی کردووە لەچاو ساڵی پار، ئافەرم.

- کەسی بەرامبەر: نەخێر..... دوو مانگ لەمەوپێش نەتبینی بووم زۆر لە ئێستا لاوازتر بووم.

باشە بۆچی وشەی "نەخێر" بەکاردەهێنی کە بۆ دەربڕینی هاوڕا نەبوون بەکاردێ، لەکاتێکدا هەردووکتان کۆکن لەسەر ئەوەی کێشت کەمی کردووە؟ ئەگەر وشەی "نەخێر" ی بگۆڕیایە بۆ "سوپاس" ئەوا بە دڵنیاییەوە کەسی بەرامبەر هەستێکی جیاوازتری بەتەواوی بۆ دروست دەبوو!!

- کەسی وا هەیە دەڵێت: بەڕاستی جگەرەکێشان کاریگەری زۆر خراپی هەیە بۆ تەندروستی، ئەو کەسەش لە شوێنە گشتییەکان جگەرە دەکێشێت زیان بەخەڵکێکی زۆر دەگەیەنێت.

- کەسی بەرامبەر: بەڵام پێویستە ئەو بابەتە قەدەغەبکرێت.

وشەی " بەڵام" لەسەرەتای ڕستەکەوە هیچ واتایەک نابەخشێ، نە بەواتای ناڕازی بوون نە ڕەزامەندی دەربڕین نایات. (بەڵام) جگەرەکێشان باشە؟ یان (بەڵام) جگەرەکێشان خراپە؟ ئەو وشەیە هیچ پەیوەندی بە باسەکەوە نییە و هیچ پێویست نییە، تەنها وایکردووە کەسی بەرامبەر هەست بە ڕووبەڕووبونەوە یان دەربڕینی ناڕەزایەتی بکات، لەکاتێکدا هیچ لارییەک نەبووە لەبارەی زیانی جگەرەوە.

٢ـ دەنگ بەرزکردنەوە، خێرایی وەڵامدانەوە، زۆر قسەبڕین بەوانی دیکە!!

زۆر قسەبڕین بەوانی دیکە یەکێکە لە نیشانەکانی مشتومڕ هەروەک پێش تریش ئاماژەمان پێکردووە، هەروەها خێرا وەڵامدانەوە و هەڵچوون لەکاتی قسەکردن وا دەکەن هەستی منافەسەکردن دروست بێت، بارودۆخەکەش جێگیر نەبێت، هەروەها خێرا وەڵامدانەوە و زوو هەڵچوون هەستی دۆڕان لای خاوەنەکەیان دروستدەکەن، هەر بۆیە دەیەوێت پێش کۆتایی هاتنی گفتۆگۆکە سەرکەوتن بەدەستبهێنێ.

بێگومان دەنگبەرزی هێمایەکی دیار و باشە بۆ جیاکردنەوەی وتووێژ لە مشتومڕ، ئەوکەسەی ڕاهاتووە دەنگی بەرزبکاتەوە لەکاتی وتوێژکردن، زۆربەی کات بەشێوەیەکی نەرێنی کۆتایی بە وتووێژەکانی دێت، چونکە دەنگبەرزکردنەوە یەکێک نییە لەتایبەتمەندییەکانی وتووێژکردن. دەنگ بەرزکردنەوەش جۆرێکە لە توندووتیژی، توندوتیژیش وا دەکات لایەنی بەرامبەر بەهەمان شێوە توندووتیژانە وەڵامبداتەوە، یان لانی کەم وا دەکات کەسەکە بەرگری "لەخۆی بکات" پێشتریش وشەی "من یان تۆ" مان باسکردووە کە وادەکات باسەکە چیتر بابەتییانە قسەی لەسەر نەکرێت...) و دەبێتە باسی تۆڵەسەندنەوەی

كەسی، (بۆچوونی من) و (بۆچوونی تۆ)، (من )و (تۆ)....
لەم نێوەندەدا ڕاستی لەنێو دەچێت.

هەندێ كات ئامۆژگاری كەسی بەرامبەرت دەكەی تاوەكو دەنگی نزم بكاتەوە، گوێ بیست دەبین كاتێك یەكێ دەڵێت: براكەم بۆ هاوار دەكەی؟ ئێمە وتووێژ دەكەین خۆ شەر ناكەین" كەسەكەی تریش دەڵێت: " هاوار ناكەم... من خۆم دەنگم بەم شێوەیەیە.. (بەدەنگێكی بەرز وا دەڵێت).

ئاگای لەوە نییە بەدەنگێكی بەرز قسە دەكات، هەر لەبیریشی نییەدەنگی چەند بەرزە یان چەند نزمە!، تەنها بیر لە بابەتەكە دەكاتەوە، بۆیە بایەخ نادات بە بەرز و نزمی دەنگی و هەموو ڕۆتینەكانی ئاخاوتن.

ئەگەر ڕاستەوخۆ ڕێنمایی ئەم مرۆڤە بكرێت بۆ ئەوەی دەنگی نزم بكاتەوە، ڕەنگە وا هەستبكا فەرمانی بەسەردا دەكەی، دەكرێ تاڕادەیەك بێزێزی بێت بەلایەوە. هەر بۆیە وەڵامت ناداتەوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە زیاتر دەنگی بەرزدەكاتەوە و دەڵێت: " خۆم دەنگم ئاوا بەرزە" ئەگەرچی ڕەنگە خۆی بەم شێوەیە دەنگی بەرز نەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لەبازنەی وتووێژ دەرچووە بۆ بازنەی مشتومڕ دەنگی ئاوا بەرزبووەتەوە،

ڕاستەوخۆ ڕێنمایی کردنیشی بۆ ئەوەی دەنگی نزم بکاتەوە ئەنجامەکەی بەم شێوەیە دەبێت...

لێرەدا پێشنیار دەکرێت ڕاستەوخۆ کەسەکە ئاگادار نەکەیتەوە دەنگی نزم بکاتەوە، بێگومان ئامۆژگاری دەکرێ بە هیچ شێوەیەک قسەکانی پێ نەبڕدرێ، چونکە ئەگەر وا بکرێ دەرئەنجامێکی خراپتری دەبێت، بەڵام باشترە چاوەڕوان بی تاوەکو قسەکانی تەواو دەکات پاشان لەبارەی بابەتەکەوە زۆر ئاسایی و لەسەرخۆیانە دەست بە قسەکردن بکەی، بەم شێوەیە زیاتر لەجارێک بەردوام دەبیت دواتر دەرئەنجامێکی زۆر ئەرێنی بەدەستدەهێنی لەلایەن کەسی بەرامبەرەوە.

ئەو شتەی زۆر بەلامەوە گرنگە خوێنەری ئازیز، ئەی خوێنەری هاوڕێم تۆ ئەو کەسە نەبی لەکاتی گفتوگۆکردن دەنگ بەرز دەکاتەوە، چونکە بەم کارە بابەتییانەی باسەکە لەدەستدەدەی، باسەکە لە وتووێژەوە بۆ مشتومڕ دەگۆڕێت.

❋❋❋

## ڕەخنەگرتن لەکەسی قسەکەر

ئەمەش بەهەمان شێوە یەکێکە لەنیشانەکانی ڕەخنەگرتن، ڕاستی ئەوەیە ڕەخنە لە قسەکە بگیرێت نەوەک لە کەسی قسەکەر، بەڕاستی ئەوەش خووێکی دیارە لەناوماندا لەکاتی وتوێژەکانماندا کە لە ئەنجامی کاردانەوەی ئەو جۆرە ڕەخنەگرتنە نابابەتییانە زوو مشتومڕ دەگۆڕێت. بۆ نموونە دەبینین کەسێک لەسەر کارەکەی لە کۆمپانیا بەم شێوەیە لەبارەی بابەتێکەوە دەدوێ:

- کەسی یەکەم:" کۆتا ڕێکلامی کۆمپانیاکەمانم زۆر بەدڵە، بەڕاستی ئەم کۆمپانیای ڕێکلامە کارێکی زۆر باشی کردووە"

- کەسی دووەم: "دەزانی کێشەی تۆ چییە؟... کێشەت ئەوەیە تەنها لەیەک ڕووەوە بڕیار لەسەر شتەکان دەدەی، بە بۆچوونی من کۆتا بانگەشە دەکرا زۆر لەوە باشتر بێت، کۆمپانیای ڕێکلامیش تەنها پارەکەی خواردین و تەواو"

- کەسی یەکەم: بێگومان هەمیشە باشترین هەیە، بەڵام ئەم ڕێکلامەش تاوەکو ئێستا دەرئەنجامێکی باشی هەبووە، ئایا تێبینی ئەوەت نەکردووە چۆن ئاستی فرۆشتنمان زیادی کردووە لەدوای ئەو ڕێکلامەوە؟

ـ کەسی دووەم: تۆ لە دڵی خۆتەوە سەیردەکەی هەر بۆیە خەڵکی فریوت دەدا.. لەژیانتدا ڕێکلام و ئاستی فرۆشیاری باش و بەرزت نەبینیوە.

هەردووکیان باسی ڕێکلامی کۆمپانیاکە دەکەن، بەڵام کەسی دووەم دەست دەکات بەڕەخنەگرتن کاتێک بەساویلکە و کەم ئەزموون وەسفی کەسی یەکەم دەکات، باسەکەی گۆڕی بۆ شتێکی زۆر دوورتر لە بابەتی ڕێکلامی کۆمپانیاکە; لەبەر ئەوەی کەسی یەکەم بەشوێن بەهانەیەک دەگەڕێت تاوەکو بەرگری لەخۆی بکات، یان تۆمەت ئاڕاستەی کەسێکی دیکە بکات لەپێناو بەرگریکردن لەخۆی، یان بکەوێتە وەسفکردنی خۆی، تەنها لەبەرئەوەی بە کەم ئەزموون ناوزەند نەکرێ لەلایەن هاوڕێکەیەوە... بەم شێوەیە زۆر دوور دەکەونەوە لە ئەسڵی بابەتەکەیان..

ڕەنگە ڕێکلامەکەش بەڕاستی باش نەبوبێت، بەڵام هێرشکردنە سەر کەسی بەرامبەر باشترین ڕێگە نییە بۆ باسکردنی ئەو کێشەیە، چونکە بەم شێوەیە کێشەکەیان پێکەوە تاوتوێ نەکردووە و نەگەیشتوونەتە هیچ ئەنجامێ.

باشتربوو کەسی دووەم ڕەخنە بگرێن لەخودی ڕێکلامەکە لەڕووی هونەری و مادییەوە، تاوەکو تێڕوانینی خۆی بخاتەڕوو،

پاشان پێکەوە بیریان بکردایەتەوە لە چۆنیەتی بەرەوپێشبردن و باشترکردنی ڕێکلامەکە.

(وشە نهێنییەکە بریتییە لە... ڕەخنە لە قسەکان بگرە، بەڵام لەکەسەکان نا.. کردارەکە سەرزەنشت بکە، بەڵام بکەرەکەی نا.. تکایە، لە بکەرەکەی بگەڕێ.)

کاتێک ئەو بابەتانە دەخوێنینەوە باس لە پەروەردەکردنی منداڵ دەکەن، دەبینین ڕەخنەگرتن لەکردارەکە خوازراوە، بەڵام ڕەخنەگرتن لە بکەرەکەی بەتەواوی ڕێگەپێنەدراوە. کاتێک منداڵ شتێک دەشکێنێ لەماڵەوە دەبینی دایکەکە دەڵێت:

- ئەی خوایە تۆ چەند منداڵێکی کەمتەرخەم و بێ هۆشی... شتێک نییە دەستت لێی دابێت و نەت شکاندبێ!!!

ئەم منداڵە دایکی بەردەوام لێی دووبارە دەکاتەوە کە کەسێکی کەمتەرخەم و سەرەڕۆیە، ئاخۆ تا چ ئاستێ متمانەی بە تواناکانی خۆی هەیە؟ گیانی بەرەنگاربوونەوەی هەیە؟

دایک بۆ منداڵ سەرچاوەیەکی جێی متمانەیە... " دایکم وتی من کەسێکی کەمتەرخەم و سەرەڕۆم.. کەواتە من کەسێی کەتەرخەمم"..

کاتێک گەورە دەبێت و بەڕێوبەرەکەی پێی دەڵێت: "زۆر دواکەوتنت لەکارەکەت لە بەیانیاندا دەرئەنجامی کەمتەرخەمیتە.."

کارمەندەکە لەدڵی خۆیەوە دەڵێت: "زۆر دواکەوتووی کاکی بەڕێوبەر، من بیست ساڵ لەمەو پێش ئەوەم زانیوە. خودا لەدایکم خۆشبێت.. بەردەوام پێی دەوتم کەمتەرخەم"..

بێگومان تازە ئەو خووی دواکەوتنەم ناگۆڕێت.. چونکە هەرچی بکەم هەر کەمتەرخەم دەبم چی بکەم سروشتی من بەم شێوەیە"... خودای گەورە لێت خۆشبێت دایکە!!

دەبێت شتەکان بەناوی خۆیانەوە ناوبنێین، بۆ نموونە ئەگەر کارمەندێک لەو ڕاپۆرتەی داوای لێکراوە هەڵەی کرد، دەکرێ بەڕێوبەرەکەی بەشێوەیەکی بابەتیانە ڕێنمایی پێبدات... یان ڕەخنە بگرێت لەخودی کەسەکە و بابەتییانە نەبێت، واتا ڕەخنە لە باشی ئاستی ڕاپۆرتەکە، یان ڕەخنە لە خودی کارمەندەکە بگرێت...

## ڕەخنەی بابەتییانە (النقد الموضوعي)

بەڕێوبەر بەکارمەندەکەی دەڵێت: ئەمە ئەو ڕاپۆرتە نییە کە لەسەری ڕێکەوتبووین.. ژمارەکانی ساڵی پاری تێدا نییە تاوەکو بتوانین ژمارەکانی ئەمساڵی بەراوردبکەین، دەبوا لەسەر خەتی بەیان بوایە بەم شێوەیەی لەسەری ڕێکەوتبووین... خۆزگە ئێستا هەرشتێک لات ڕوون نییە پرسیار بکەی لەبارەیەوە تاوەکو ئیشەکانمان نەبن بە دووئیش.

## ڕەخنەی نابابەتییانە (النقد غير الموضوعي)

بەڕێوبەر بەکارمەنەکەی دەڵێت: بەم شێوەیە ئەمڕۆ تەواو نابین.. باشە من دەبێ هەموو شتێ خۆم بیکەم؟ ڕاپۆرتێک بەو ئاسانییە نازانی دروستبکەی؟ ، باشە تۆ هەمیشە بەم شێوەیەی، باشە کێ بهێنم ئەم ئیشە بکات؟ من کەسێکم دەوێت کارم بۆ بکات... کوا ساڵی ڕابردوو؟ کوا وێنەکە؟ کوا ئەو ڕاپۆرتەی داوامکردبوو؟ ئەمە ئەو ڕاپۆرتە نییە کە داوامکردبوو.. من ئەوەم دەوێ کە داوامکردبوو!!

بەڕێوبەرە ڕەخنەگرە نابابەتییەکە بەردەوام دەبێت لە داواکردنی ئەو ڕاپۆرتەی داوای کردبوو.....!

بەو شێوەیە کێشەکەی چارەسەر نەکرد، بەڵکو کێشەیکی دیکەی دروستکرد، دەرگای بۆ مشتومڕ کردۆتەوە لەگەڵ

کارمەندەکەدا; تەنها لەبەر ئەوەی کارمەندەکە لەداواکارییەکەی تێنەگەشتووە، نەیزانیوە کێشەکە لەکوێدایە، ڕەنگە کارمەندەکە بێتە دەرەوە و بە هاوکارەکانی بڵێت ئاسکەکە ئەمڕۆ هیچ جەوی نییە.. "کەس نەچێت بۆ ژوورەکەی".. تەنها سوود کە کارمەندەکە پێی گەشتبێ هەر ئەوەندە دەبێت، بێگومان ناتوانێ ڕاپۆرتەکە بەشێوەیەکی باش بکات، چونکە لەبنەڕەتدا نازانێ چی داواکراوە لێی.

لەکاتێکدا بەڕێوبەری یەکەم " الموضوعي" (بابەتییەکە) هەلی بەخۆی بەخشی هەموو کەم و کورتییەکانی ڕاپۆرتەکەی شیکردەوە و، هەلیشی بە کامەندەکە بەخشی بۆ تێگەشتن لەوەی داوای لێکراوە. بەبێ ئاڕاستەکردنی هیچ ڕەخنە گرتنێکی شەخسی لە بابەتی بوونی قسەکان کەم بکاتەوە و، گفتوگۆکە لەناوبەرێت و ڕەشەبای مشتومڕ بهێنیت کە نابابەتییانەشە.

زۆربەی کات کێشە نابابەتی بوونی ڕەخنەگرتنەکە نییە بەڵکو بەهۆی وەڵامدانەوەی ڕەخنەکەوەیە.

ڕەنگە ڕەخنەکە بابەتی بێ، بەڵام وەڵامدانەوەی ڕەخنەکە نابابەتییە، زۆربەی کاتیش بەمەستی بەرگریکردنە لە خود لەکاتێکدا هیچ تۆمەتێک ئاڕاستە خودی کەسەکە نەکراوە..

بۆنموونە:

- پیاو بە خێزانەکەی دەڵێت: خۆزگە ئەو پەنجەرەیە دابخەی ئاوا باشتر بێت، با منداڵەکان سەرمایان نەبێت کاتێک خەوتوون

- (بابەتی بوون زۆر ئاشکرایە).

- خێزانەکەشی دەڵێت: ئەمە واتا چی؟ من ئاگام لەمنداڵەکانم نییە؟ بابزانی من منداڵەکانی خۆم خۆشدەوێ.. لەهەر کەس زیاتر خەمیان لێدەخۆم - (وەڵامێکی نابابەتی..)

کێ باسی ئەوەی کردووە کە ئەو منداڵەکای خۆش ناوێت؟ باسەکە لەبارەی پەنجەرە و هەوای ساردبوو!!

*** 

- ئەگەر بەڕێوبەر بە کارمەندەکەی بڵێیت: ماوەیەکە لەکارەکەت دوادەکەوی، کاتی ئیشکردن هەشت و نیو دەست پێدەکات، بەئەرک نەبێت کەمێک ئاگاداری ئەو بابەتەبە - (ڕەخنەیەکی بابەتی...)

- کارمەندەکە: نەخێر مامۆستا مەنسوور، من کەسێکم بە هەموو شتێک پابەندم نەک هەر تەنها لە پەیوەستبوون بەکاتەوە. ئەوەی ڕویداوە تەنها چەند ڕۆژی ڕابردووە کە دواکەوتووم، ئەمە

واتای ئەوە نییە من کەسێکی کەمتەرخەم و شکستخواردووبم و ئاگام لەکارەکانم نەبێت. (وەڵامێکی نابابەتی...)

کێ باسی شکستخواردوویی کردووە؟ باسەکە لەبارەی دواکەوتن و پەیوەستنەبوونی بە کاتەوە بووە بۆ سەر کارەکەی، بەڕاستی دواکەوتووە لەسەر کارەکەی!!

بەم شێوەیە ڕەخنەی بابەتی (واتا ئاخاوتنەکە مەبەست لێی تەنها بابەتەکەیە نەوەک خودی کەسەکە) کە گفتوگۆکە دەوڵەمەند دەکات و وادەکات ئەگەر لەسەر حەق نەبوو لایەنی بەرامبەر بەخۆیدا بچێتەوە، بەڵام ئەگەر لەسەر حەق بوو ئەوا ڕەخنەی بابەتی دڵی ناشکێ و باسەکە لە ووتووێژەوە ناگۆڕێ بۆ مشتومڕ.

***

## پوختەی جیاوازی نێوان وتوویژ و مشتومڕ

مشتومڕکردن کارەساتە... کەسانی مشتومڕکار لە ڕاستیدا ستەم لەخۆیان دەکەن؛ لەبەر ئەوەی زۆربەی کات لە ئەنجامی زۆر مشتومڕکردنیان لەگەڵ خەڵکی تایبەتمەندی کۆمەڵایەتییان نییە کە دەبێتە هۆیٚ دروستبوونی ڕق و کینە، دوژمن بۆخۆی پەیدا دەکات و هاوڕێکانیشی لێی دووردەکەونەوە.

لەکاتێکدا ئەو کەسەی زۆر بەشداری گفتوگۆکان دەکات تەنانەت ئەگەر بابەتەکان زۆر وشک و سەرەنج ڕاکێش بن، دەبینی لەهەموو کۆڕەکان پێشوازی لێدەکرێت، بەشداردەبێت لە دەوڵەمەندکردنی کۆڕەکان بە وتوێژەکانی، کاتێک قسەی تەواو بوو دەرفەت بەکەسی بەرامبەریشی دەدات قسە بکات و گوێی بۆ دەگرێت، بەشێوازێکی جوان ڕەخنە دەگرێت؛ کەس تەریق ناکاتەوە و هێرش ناکاتە سەر هیچ کەسیٚ، بەشوێن خاڵی هاوبەشدا دەگەڕێت لەنێوان خۆی و کەسی بەرامبەر تاوەکو متمانە دروستبێت لەنێوانیاندا؛ تاوەکو گفتوگۆکردنیان ئاسانتربێت لەبارەی خاڵە ناهاوبەشەکانیانەوە بەشێوەیەکی بابەتی و بێلایەنانە.

جیاوازییەکانی نێوان مشتومڕ و وتوویژ بەهۆی ئەو خاڵانەوە دیاری دەکرێت:

Scanned with CamScanner

- ڕوبەڕووبوونەوە/ بەرپەرچدانەوە.
- دەنگ بەرزکردنەوە.
- خێرا وەڵامدانەوە.
- زۆر قسە بڕین بەکەسی قسەکەر.
- ڕەخنەگرتن لەخودی کەسی قسەکەر.

❊❊❊

# بازنەی کەسی

بازنەی کەسی چییە؟

ناوچەی سەلامەتی پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکانە، ئەو ناوچەیەی پێمان وایە هەرکەسێک تێیدابێت ئەستەمە لەدەستی بدەن..

ئەو بازنەیەیە تێیدا زۆربەی کەسە نزیکەکانمانی تێدایە لەوانە: دایک و باوک، خوشک و برا، هاوسەر، هەندێ لەکەسە نزیکەکان، هاوسێکان، هەروەها لەنێویدا هاوکار و کارمەندانی ژێر بەڕێوبەرایەتیمان، هەموو ئەوانەی بەردەوام لەخزمەتی ئێمەدان لەسروشتی مۆڤایەتی.

زۆر بەئاسانی دەکرێ تێبینی ئەوەبکەین هەموو ئەوانەی کردوویانمانەتە بازنەی کەسییەوە زۆر بەکەمی گرنگیان پێدەدەین، ئەو قسە خۆشانەی بەشێوەیەکی زۆر لەگەڵ کەسانی بێگانە بەکاریان دەهێنین، دەبنینین زۆر بەدەگمەن لەگەڵ ئەوکەسانە کە دەیانکەینە بازنەی کەسیەوە بەکارییان دەهێنین!

قسەی خۆش بوونی نییە لەنێوان کەسە نزیکەکانی نێو خێزان یان دەرەوە، شتێک پەیدا دەبێت پێی دەگوترێ ڕۆشنبیری (بێ سەلیقەیی)!!

چونکە ئەوە کەسە نزیکەکانن بەشێکی گەورەی ژیانمانیان پێک هێناوە، زۆر مامەڵەکردن لەگەڵیان لەسەر بنەمای خۆشویستنی کەسی (عشم) وادەکات زۆربەی مامەڵەکردنەکانمان خاڵی بن لە نەرم و نیانی و ڕووخۆشی و قسەخۆشی، بەتێپەڕبوونی کات تێبینی ئەوە دەکەین کە ڕاهاتوین لەسەر بێ سەلیقەیی.

بۆ نموونە:

کاتێک گەنجێک بەیانیان لەخەو هەڵدەستێ زۆر ئاساییە لامان کە گوێبیست بین بە دەنگێکی خاڵی لەهەست و بێ ئەوەی سەیری ڕوخساری دایکیشی بکات ڕاستەوخۆ دەڵێت: "چاییەک" یان "نانی بەیانی کوا"

تێبینی ئەوە دەکەین ئەم گەنجە وشەکانی "ڕوخسەت وەگرتن و ناوهێنان" ی سڕیوەتەوە، کە هەردووکیان دووشتی زۆر گرنگن بۆ گەرم و گوڕی لە ئاخاوتندا. دەبینین دەستەواژەکانی مۆڵەت وەرگرتن لەکاتی پرسیارکردن وەک "بەئەرک نەبێ" یان "بەیارمەتیت" سڕیوەتەوە، دەبینین ناوهێنانی کەسەکەی سڕیوەتەوە کە ئاماژە بە ڕێزگرتن دەکات؛ واتا ناوهێنانی کەسەکان بەناوی خۆیانەوە یان بەو پلەیەیی هەیانە.. لەم نموونەیەشدا ئاماژەی ڕێزگرتن بریتییە لە وشەی "دایە"

ئەمە ئەزموون بکە...

ئەگەر گفتوگۆت لەگەڵ کەسێکدا کرد و ویستت توندوتیژی گفتوگۆکە کەم کەیتەوە، ئەوا دەبێت زۆر شت بکەی، بەڵام ئەوەی لای ئێمە گرنگە لێرەدا، بانگکردنیەتی بەو ناوەی زیاتر بەلایەوە خۆشە...

- دایک: ئەی محمد تۆ لە مەبستم تێناگەی.
- کارمەند: ناکرێ ئەمڕۆ تەواو بێت کاکی ئەندازیار.
- خوێندکار: بەڵام دکتۆر هەڵەیەک هەیە لە کۆکردنەوە.
- هاوڕێ: ئەی تاقانەکەم(نازبدە بە ناوی تارق) تۆ ئەمڕۆ هیچ تەرکیزت لای من نییە.

ئەگەر لەو ڕستانەی سەرەوە ناوەکان بسڕیتەوە، دەبینی کە هەستەکان بەتەواوی ئەگۆڕێن، دەبینی هەمان ڕستە جۆرێک لە بەرەنگاربوونەوە و بەرهەڵستی پێوە دیار دەبێت... بانگکردنی کەسەکان بەو ناوەی حەز بە بیستنی دەکەن کەش و هەواکە پڕ دەکات لە سۆز و ڕێزگرتن.

- سەرەنجی جیاوازییەکان بدە دوای لابردنی ناوەکان:

- تۆ لە مەبەستم تێناگەی.
- ناکرێ ئەمڕۆ تەواو بێت.
- هەڵەیەک هەیە لە کۆکردنەوەکەدا.

- ئەمڕۆ هیچ تەرکیزت لای من نییە.

تێبینی جیاوازییەکانت کرد ئێستا؟

تەنها بە لابردنی ئەم دەستە سادانە ڕەنگە وەک وشکردنەوەی گوڵ بێت، گوڵەکە دەمێنیتەوە بەڵام بێ گیان و بێ بۆن دەبێت. ئەگەر مرۆڤ بەردەوامبوو لەبەکارهێنانی ئەم دەستەواژانە لەگەڵ خێزان و کەسە نزیکەکانی ئەوا هەست بە گۆڕانی ڕیشەیی لە جۆری پەیوەندییەکانی دەکات... بەڵکو هەست بەوە دەکات کەسانی دەوروبەری بە شێوەیەکی نەرم و نیانی و عیرفانی مامەڵەی لەگەڵ دەکەن.

ئەمەش لەبەر ئەوەی مرۆڤ زیندانی چاکەیە.

## کورم ئەو برامە

یەکێک لەکێشەکانی بازنەی کەسی ئەوەیە هەندێ کەس زیادەڕەوی دەکەن لە بێ سەلیقەیدا، تەنها بۆ ئەوەی پتەوی پەیوەندییان لەگەڵ کەسی بەرامبەر دەربخەن.

بۆ نموونە:

- سڵاو... چۆنی کوڕی... (بەحسابی خۆی ئاماژەیە بۆ بەهێزی پەیوەندییەکەیان بەجۆرێکە کە تەنانەت بنەما گرنگەکانی مرۆڤی تێپەڕاندووە) ... سەیر ئەوەیە خۆشەویستەکەی من.. بزانە تەنانەت جنێویشی پێ دەدەم.

یان بۆ نموونە:

- یەڵا، هەستە بابچین بۆلای، مەوعید و شتی چی، نە تەلەفۆنی بۆ دەکەم نە هیچ، ئەوە برامە.. یانی لە براکەم مۆڵەت وەرگرم؟"

وەک ئەوەی بڵێی ئەو برا خۆشەویستەی هیچ ئیش و کار، چاوپێکەوتن، سەرئێشە، میوان یان هیچ شتێکی نەبێت لەئێستادا ڕێگربێت لەچاوپێکەوتنی کەسانی دیکە.

کاتێک ئەم جۆرە مامەڵەکردنانەمان بەرچاودەکەوێ دەڵێین کێشە نییە بازنەی کەسی (دائره العشم) کوژەرە. چونکە ئەوانەی بەم شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ بەم جۆرە

نەدەبوون ئەگەر بەدبەختیان نەیانی کردایەتە ئەو بازنە کەسیەوە.

## "سەیری ئەو نارەسەنە بکە.."

هەندێ کات دەبینین ئەگەر کەسێک لە شوێنێک دانیشێت کە کەسی نەناسێ تەنها یەک کەس نەبێ ئەوا دەستدەکات بەگاڵتەکردن یان هێرشکردنە سەر ئەو کەسە تاوەکو خۆی لەوانی دیکە لە دانیشتنەکەدا نزیک بکاتەوە، بێگومان ئەوەش لەسەر حیسابی کەسە نزیکەکەی، ئەوەی کە پەیوەندییەکەیان بە گاڵتەپێکردن یان هێرشکردنە سەر یەکێک پەیوەندیەکەیان لەناوناچێت. چونکە پەیوەندییکەکەیان بەهێزە. تەنها لە دەرگای خۆشویستنی کەسییەوە ئەویش ئەوە دەکات بۆ بەدەستهێنانی متمانەی کەسانی نامۆ.

هەر بۆیە بە درێژایی مێژوو دەبینین هەندێ لە کەسە سەکەوتووەکان و سەرکردە و داهێنەر و خاوەن بڕیارەکان کاتێک بوونە بە کەسایەتییەکی گشتی و خاوەن ڕێز لە کۆمەڵگەدا، دەبینین لەهاوڕێکانیان دووردەکەونەوە و وەکو ڕۆژانی ڕابردوو نین، هەندێ کاتیش خەڵکی بە بێ وەفا باسیان لێوە دەکات.

یەکێ لەهاوڕێکانی دەڵێت: سەیری ئەو نارەسەنە بکە.. چیتر وەک پێشوو نەماوە و هاوڕێکانی پێشووی لەبیرکردووە"!

هەندێ کات ڕەنگە ئەو کەسە بەڕاستی بێ وەفابێت... بەڵام ڕەنگە ڕاستی بابەتەکە ئەوە بێت پێشتر خۆی و هاوڕێکانی لەهەمان بازنەی کەسی بوونە و بە بێ سەلیقەی مامەڵەیان لەگەڵ یەکتر کردبێت، بەڵام ئێستا ناتوانێت بەهامان شێوە مامەڵەیان لەگەڵ بکات پاش ئەوەی گەیشتۆتە ئاستێکی لەو شێوەیە لەکۆمەڵگەدا، چونکە تەنها پەیوەندی بوونی لەگەڵیان لەهەمان بازنەی کەسی ڕاستەوخۆ کاریگەری خراپی لەسەر دەبێت، بەتایبەت ئەگەر لەپێش چاوی کۆمەڵگە نوێیەکەی بێت کە زیاد ڕێزی دەگرن تێیدا. ئەگەر بەڕەسمیات قسە بکات لەگەڵیان بۆ هەمووان ناخۆش دەبێت...هەر بۆیە بڕیاردەدات کە دووربێت لێیان تاوەکو توشی شەرمەزاری نەبێت... و خۆی بەدوور بگرێ لە بازنەی کەسی

❊❊❊

## پوختەی بازنەی کەسی

دەکرێ جیاوازی نێوان ڕوخۆشی و هاندان و پیاهەڵدان و دووڕوویی زۆر ئاشکرا نەبێت لای هەمووان، بۆیە هەندێ کات دەبینی دووڕوویی بە ڕووخۆشی و پیاهەڵدانیش بە هاندان دەژمێردرێت.. لێرەدا جەخت ناخەمە سەر ڕوونکردنەوەی واتای ئەو وشانە، بەڵام ئەوەی بەلامەوە گرنگە هێزی ڕووخۆشی و قسەخۆشییە لەسەر دڵی مرۆڤەکان، مەبەست لەمە زیادەڕۆییکردن نییە لە وسفکردنی کەسەکە.

ئێمە زۆربەی کاتەکانمان لەگەڵ کەسە نزیکەکان بەسەر دەبەین، بەهۆی ئەوەی گرێنتی لەدەست نەدانیانمان هەیە زۆر لەخۆمان ناکەین و ئاسودەین لەگەڵیان "ئەمەش هیچ عەیبەیەکی تێدا نییە" بەڵام عەیب لەوەدایە سەلیقە و هاندان و قسەخۆشی لەقسەکانماندا نەبێت و بەم شێوەیە چیتر قسەکانمان وشک دەبن، و پەیوەندییەکانمان سارد دەبێت، ئەو قسەی پێشینانەش بەڕاست دەگەڕێ کە دەڵێت: "پێغەمبەران لەنێو نەتەوەکەی خۆیان گوێیان لێناگیرێت"، لەجێی ئەوە دەتوانین بڵێین ئەو مرۆڤەی لە بازنەی کەسیدایە هیچ شکۆیەکی نییە.

***

# هونەری ئاخاوتن

## پوختە

ئەگەر تۆ لەو کەسانەی حەز بەزانیاری کورت و پوخت دەکەی، ئەوا ڕێگەم بدە بەم شێوەیە باسی هونەری ئاخاوتنت بۆ بکەم، واتا هەمووی ئەوەی کە باسمانکردووە بەشێوەیەکی کورت بۆت باس دەکەمەوە، لەگەڵ وشەیەکی نهێنی کە یارمەتیت دەدات لەهەموو بەشەکانی هونەری ئاخاوتن بگەیت لەڕێگەی پوختەی هونەری ئاخاوتنەوە.

ئەبێ خشتە دروست بکەم

هونەری ئاخاوتن

- باش گوێگرتن وشە نهێنیەکە: گرنگی بدە بە قسەکەر زیاتر لە بابەتەکە.
- قسە پێ نەبڕین وشە نهێنیەکە: بەم جۆرە مامەڵە بکە کە حەزدەکەیت خەڵکی لەگەڵ تۆ مامەڵە بکەن.
- وتووێژ لەجێگەی مشتومڕ وشە نهێنیەکە: با ئامانجت گەیشتن بێت بەڕاستی نەوەک خۆسەپاندن بەسەر لایەنی بەرامبەر.

- سەلیقە هەبوون لەکاتی قسەکردن   وشە نهێنیەکە:  ئەوەی دەیڵێیت و   دەیکەیت لەناو بازنەی کەسی ناونیشانی تۆیە.

## حەوت وێستگەکە

لەهونەری ئاخاوتندا حەوت وێستگەی سەرەکی هەیە: لەهونەری ئاخاوتندا. هەستمان بەوەکرد کاتێک باسی هونەری ئاخاوتن بکرێت دەبێت ئاماژە بەم وێستگانە بکرێت، چونکە ئەم وێستگانە پەیوەستن بە گفتوگۆی ڕاستەقینە و هەڵوێستی واقعی کە هەموومان ڕووبەڕووی دەبینەوە و کاری پێ دەکەین بەهەر شێوەیەک بێت، ئەوانیش بریتین لە:

**١) پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان.**
**٢) سەرکۆنەکردن.**
**٣) لەپاشملە باسکردن.**
**٤) گشتاندن.**
**٥) پێویستییەکان.**
**٦) بەڕێز.**
**٧) قسەکردن بریتییە لە زانیاری وەرگرتن و بەخشین.**

کەواتە با دەست بکەین بە باسکردنی هەریەکەیان.....

# وێستگەی یەکەم

## پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان

(1)

کەسێک پەیوەندیت پێوە دەکات تۆش نازانی کێیە، ژمارەکەیت تۆمار نەکردووە و دەنگی ناناسیتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەیەوێت یادگەت تاقی بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ چەند لەلات گرنگە، لێت دەپرسێت " ئادەی بزانم دەزانی من کێم... بەخوا پێت ناڵێم، بابزانم خۆت دەمناسیتەوە یان نا.." تۆش تەواوی هەوڵی خۆت دەدەی، ئەویش هەر پێداگرە لەسەر تاقیکردنەوەی بیروهۆشت. دواتر بڕیار دەدات ئاسانکاریت بۆ بکات، دەڵێت: "باشە بۆتی ئاسان دەکەمەوە کۆلێژی بازرگانی"، دەبینیت ئەوە بەس نییە بۆ ئەوەی بیناسیتە و بەزەیی پێتدا دێتەوە، دەڵێت: زانکۆی عين الشمس... بەخوا لەوەندە زیاتر هیچی دیکەت پێناڵێم" . جا لەبەر ئەوەی کۆلێژی بازرگانی زانکۆی عين الشمس هەزاران مرۆڤی تێدایە بۆیە ناتوانی بزانی کێیە ئەو کەسە. ڕەنگە پێی بڵێیت: بەڕێزەکەم چیتر تاقەتم نەما، تکایە بڵێ بزانم کێی، بەخوا من سەرقاڵم. ئەویش هەر وازت لێناهێنێ تاوەکو نەڵێی کە کێیە، یان مۆبایلەکەی بەسەردا دانەخەیت.

ئامۆژگاری: یادگەی کەس لە تەلەفۆندا تاقی مەکەرەوە، سەرەتا باشترە بە سەلامکردن دەست پێ بکەیت، وە ئەگەر کەسی بەرامبەر نەیناسیتەوە خۆت بناسێنە پێش ئەوەی دەست بەقسەکردن بکەیت.

# هێشتا لە وێستگەی یەکەمین لەکاتی پەیوەندی تەلەفۆنیدا

## (2)

لەژیانتدا ڕوویداوە کەسێک زیاتر لەجارێک لەیەک کاتدا تەلەفۆنی بۆ کردبیت، ئەگەرچی ناوی ئەو کەسەی تەلەفۆن دەکات لە مۆبایلەکەدا دەردەکەوێت و نادیارنابێت کە کێ تەلەفۆنی کردووە... لەگەڵ ئەوەشدا دەبینی کەسێک زیاتر لەجارێک پەیوەندیت پێوە دەکات بەڵام تۆ ناتوانی وەڵام بدەیتەوە چونکە ڕەنگە لە حەمام یان لەناو نوێژدا بیت. سەیر دەکەی ١٥ جار پەیوەندی کردووە لەسەر یەک، کاتێک پەیوەندی پێوە دەکەیتەوە پێت دەڵێت تەنها بۆ هەواڵپرسین پەیوەندی کردووە. زۆر کات لەخۆم دەپرسم ئاخۆ ئەم جۆرە کەسانە چۆن بیر دەکەنەوە؟ بۆچی وادەکەن؟ بەڵام تاوەکو ئێستا نەگەشتوومەتە وەڵام.

لەکاتێکدا ئامادە نییە ئەوەندە لەبەردەم دەرگا بوەستێ لە دەرگا بدات. هەرچەندە نابێت لە سێ جار زیاتر لە دەرگا بدرێت ئەگەر تاوەکو ئەو سێجارە دەرگەیان نەکردەوە پێویستە بڕۆیت.

لە مۆبایلدا ناوی کەسەکە و ژمارەی مۆبایلەکە بەدیار دەکەوێ کەواتە بۆچی وادەکات؟

ئاگاداری: لەم جۆرە كەسانە مەبە، ئەگەر لەژیانتدا ئەم جۆرە كەسانە هەن هەوڵبدە بەشێوازێكی جوان پێیان بڵێیت پێویست ناكات ئەو هەموو جارە پەیوەندی بكەن، لەكاتێكدا مۆبایل تایبەتمەندی پشاندانی ناو و ژمارەی كەسەی لەسەر دەردەكەوێت.

# هێشتا لە وێستگەی یەکەمین

## (3)

زۆر جار ڕوویداوە کاتێک پەیوەندیمان بەکەسێکەوە کردووە تێبینی ئەوەمان کردووە لایەنی بەرامبەر بارودۆخی دەروونی جیاواز دەرکەوتووە. کەسی وا هەیە بەدەنگێکی بەرز، زۆر بەکارهێنانی دەستەواژەی پێشوازی کردن، وەڵامدانەوە بەشێوازی پێکەنیناوی، یان بەپێچەوانەوە دەستی کردووە بەقسەکردن.

ڕەنگە لایەنی بەرامبەر دەستپێشخەری بکات بە دەنگێکی نزم، بەشێوەیەک قسە بکا هەستبکەی نەخۆشە، یان کێشەیەکی هەیە، بەڵام کاتێک پرسیاری لێدەکەیت ئاخۆ هیچ شتێک ڕوویداوە؟ بەتەواویی ڕەتی دەکاتەوە و وا خۆی پیشان دەدات کە پێی سەیرە ئەو پرسیارە دەکەیت.

گرنگە بزانین کاتێک پەیوەندی تەلەفۆنی ئەنجام دەدەین لەگەڵ کەسێک و ڕوخسارییان نابینین، ئەوا لەڕێگەی ئاستی دەنگیانەوە وێنەیەکی دیاریکراوی ئەوانمان لەلا دروستدەبێت. چونکە نایان بینین و لەسەرەتایی قسەکردن نازانین ئەو کەسە لەوکاتەدا لەکوێیە؟ و لە چ بارووددۆخێکدایە؟ پێویستە

بەشێوازێکی ئاسایی دەستبکەین بەقسەکردن تاوەکو دڵنیا دەبینەوە لەباروودۆخی کەسی بەرامبەر.

کەسانی لێهاتوو لە هونەری ئاخاوتن هەمیشە زیادەڕۆیی ناکەن لەقسەخۆشی و زۆر پێشوازی کردن لەسەرەتای پەیوەندی تەلەفۆنیدا، چونکە ئەگەری هەیە کەسی بەرامبەر لەبارودۆخێکی ئەستەم و ناڕەحەتدا بێت.

بۆ نموونە: ڕەنگە لەپرسەدا بێت، ناکرێت ئەوانی دیکە پشتگوێ بخات و بەهەمان گیانەوە وەڵامبداتەوە، دواتر ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی پەیوەندییەکە نائاسودەی پەیدا بکات بۆ هەردوولا، چونکە ڕەنگە کەسەکە ناچاربێت بابەتەکە بگۆڕێت ڕاستەوخۆ و بەشێوەیەکی نائاسایی و بەهەمان شێوەی پەیوەندیکار نەتوانێ قسەبکات.

ئامۆژگاری: بەڕێگەیەکی تەقلیدی دەست بکە بەقسەکردن لەپەیوەندییە تەلەفۆنییەکاندا، تا ئەوکاتەی دەزانی کەسی بەرامبەر لەچ بارودۆخێکدایە.

# وێستگەی دووەم

## سەرزەنشتكردن

كەسانێك هەن بەهۆی زیادەڕەوی كردن لە خۆشویستنی كەسی سەرزەنشتی ئەوانی تر دەكەن، بەڵام ڕەنگە كەسەكە نەزانێت كە زۆر سەرزەنشتكردن وا دەكات ئەوانی تر هەست بە نائاسودەیی و بارگرانی بكەن لە مامەڵەكردن لەگەڵ ئەم جۆرە كەسانە..

هەندێ كەس هەن كاتێك چاوت پێیان دەكەوێت بۆ یەكەم جار پاش ماوەیەكی دوور و درێژ، دەڵێن: "باشە ئاوا بەم شێوەیە دوایی ئەو هەمووە ماوەیە لێمان ناپرسی؟.. توخوا مەگەر ئێمە هاوڕێی یەكتر نین؟" ڕەنگە تۆش بێت بە مێشكتدا بڵێی: "ئەی تۆ بۆ لەهەواڵی من ناپرسی لەم ماوە درێژەدا... ئەی ئێمە هاوڕێ نین؟"

ئەمە باشترین گفتوگوكردن نییە لەنێوان دوو كەس كە پاشماوەیەكی دوورو درێژ چاویان بەیەك كەوتۆتەوە.

ئامۆژگاری: چاوپێكەوتنەكان بە سەرزەنشتكردن دەست پێ مەكە... سەرزەنشتكردن مەكە بەناوێك بۆ خۆت و خەڵكی پێی بتناسنەوە، بۆ ئەوەی خەڵك هەست بە بارگرانی نەكەن لەمامەڵەكردن لەگەڵتدا.

# وێستگەی سێیەم

## لەپاشەملە باسکردن(غەیبەت)..

تەنها لەڕوانگەی دینی و ئەخلاقییەوە باس لەپاشەملە باسکردن ناکەم، بەڵکو لەڕوانگەی هونەری ئاخاوتنەوە...

ئاشکرایە مەبەست لە پاشەملە باسکردن، باسکردنی کەسێکە خۆی ئامادە نەبێت، بەبێ گوێدانە ئەوەی قسەکە ڕاست بێت یاخود نا. یان بێ گوێدانە ئەوەی ئاخۆ ئەو کەسەی باسی کراوە ئازایەتی ئەوەی هەبێت ڕووبەڕووی ئەو قسەیە بوەستێتەوە یان نا، هەرچۆنێک بێت مادەم کەسەکە خۆی پێی خۆش نییە لە نەبوونی بەم شێوەیە باسبکرێت کەواتە ئەوە لەپاشەملە باسکردنە (غەیبەتە).

"ئەی ئەگەر بەم شێوەیە باسی کەسێک بکەیت چی شتێک ڕێگریت لێدەکات باسی منیش بکەیت بەهەمان شێوە لەکات و شوێنێکی تردا، کاتێک کە نێوانمان تێک بچێت؟".. ڕەنگە کەسی ژیر خۆی بپارێزێت لەوەی دڵی خۆیت بۆ بکاتەوە.

ئەگەر خەڵکی متامانەی پێت نەما، چیتر هونەری ئاخاوتن هەمان کاریگەری نامێنێت کە بە درێژایی کات لەم کتێبەدا باسی لێوە دەکەین.

لەپاشەملە باسی کەس مەکە تاوەکو متمانەی ئەوانی تر لەدەست نەدەی!

❋❋❋

# وێستگەی چوارەم

## گشتاندن..

ڕۆژهەڵاتییەکان خانەدانن!... دیمیاتییەکان بازرگانن!... ئەمریکییەکان گەمژەن!... یابانییەکان زیرەکن!... عەرەبەکان عبد الناصریان خۆش دەوێت و ڕقیان لە محمد انور ساداتە... هەمووان کۆتا ڕێکلامی کۆمپانیای پەیوەندییەکانییان بەدڵ نییە... هتد.

گشتاندن بەڵگەیە لەسەر ساویلکەی!

هەرچەندە ئەم وشەیە ڕەقە، داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام ناچارم کە بیڵێم چونکە ئەوە ڕاستییەکەیەتی، گشتاندن بەڵگەی ساویلکەییە. چۆن مرۆڤ دەتوانێ بەهۆی سیفەتێکی دیاری کراو، ڕەوشتێک، بیروبۆچونێکی دیاریکراو، گشتاندن بۆ هەموو نەتەوەیەک، وڵاتێک، یان هەرێمێک بەتەواوی بکات؟

ئەگەر لەو جۆرە کەسانەی زۆر حەز بە زیادەڕەوی دەکەن لە گشتاندندا، ئەوا پێویستە پشت ببەستی بە "باوەڕبوون" و "زۆرێتی" ، واتا بڵێی" باوەڕم وایە زۆربەی خەڵکی بەم شێوەیەیە" یان "باوەڕدەکەم زۆربەی عەرەبەکان بەم شێوەیە

بن". چونکە بەم شێوەیە قسەکەت بە ڕاستی وەڕناگیرێ، و خۆتیش توشی شەرمەزاری نەکەی ئەگەر کەسێک سوربوو لەسەر ئەوەی سەرچاوەی قسەکەت بخەیتەڕوو بان بیسەلمێنی!

ئامۆژگاری: هانا بۆ گشتاندن مەبە لە دەربڕینی بڕیار و بۆچوونەکانتدا، ئەگەر ناچاریش بویت ئەوا ڕێگەی "باوەڕبوون" و "زۆرێتی" بەکاربهێنە.

***

# ویستگەی پێنجەم

## پێویستییەكان

ئاگات لێمە... لێم تێدەگەی....پێویستی لەم شێوەیە... شتانێكی لەم بابەتە... وەک بڵێی هەم و نیم... ئەزانی چۆن... لەگەڵ من... ,you know ... هتد...

ئەم پێویستییە باوانەی خەڵكی لەكاتی قسەكردن بەهۆ یان بێ هۆ بەكاری دەهێنێت..

یاریزانی وا هەیە كاتێک قسە دەكات زۆر پێداگرە لەسەر بەكارهێنانی وشە پێویستەكان بۆ ئەوەی بەناوبانگ بێت، بەڵام ئێمە دەزانین ئەم پێویستییە دروستكراوە، بەڵام ئەو هەر بەردەوامە لەسەری چونكە پێی وایە لەكارەكەی یارمەتی دەدات... ئەگەر چی بەبڕوای من وا نییە. لێرەدا ئەوەی بۆمان گرنگە بەردەوامبوونی مرۆڤە لەسەر ئەو پێویستییانە لەكاتی قسكردن، تاوەكو وای لێ دێت دەبێتە خوویەک و دواتر ئەستەمە وازی لێبێنێت... ئەم خووە بەشێوەیەكی گشتی لەكەسایەتی مرۆڤ كەمدەكاتەوە، وا دەكات ئەوان تر وا هەست بكەن كەسێكی كۆمیدییە، بە تێپەڕبوونی كات خەڵكی تەركیزیان بۆ قسەكانی نامێنێت، چونكە كاتێک گوێی لێدەگرن

لەبیری خۆیان چاوەڕێن تاوکو گوێبیستی ئەو وشە پێویستانەبن کە بەکاری دەهێنێت.

بەتەواوی وەک ئەو دڵۆپە ئاوە وایە کە لە بەلوعەی ئاوەکەوە دەکەوێتە ناو حەوزی حەمامەکەوە بەشێوەیەکی زۆر ڕێک کە بە تێپەڕبوونی کات تەرکیزت نامێنێت بۆ هیچ شتێک و تەنها گوێ لە دەنگی ئەم دڵۆپە ئاوە دەگرێت، یان ڕەنگە نەهێڵێ خەوت لێبکەوێت ئەگەر چی ئەوەنە بێزارکەر نییە، بەڵام بەردەوامی و ڕێکوپێکی کەوتنە خوارەوەی دەستدەگرێت بەسەر تەرکیزی مرۆڤ ...وشە پێویستییەکانیش بەهەمان شێوەن.

ئامۆژگاری: خۆت ڕزگاربکە لە پێویستییەکان!

# وێستگەی شەشەم

## بەڕێز..

میسر شوێنی بەیەکگەشتنی ڕۆشنبیری و ستانییە جیاوازەکانە، هەموو ڕۆشنبیرییەکانی بۆماوەتەوە و لەم وڵاتە جوانەدا جێگیر بووە.. ڕۆشنبیری نازناوەکان یەکێکە لەوانە.

ئەگەر کەسێک لەخۆت گەورەتر بوو لەتەمەن یان پلە و پایەدا لە دونیا، ئەوا بەپێی داب و نەریت وشەی "بەڕێز" بەکاردێنی لەجێی "تۆ".. هەرچەندە زۆربەی نەوەکان بە دایک و باوکیان ناڵێن "بەڕێز"، بەڵام ئەوە بەهۆی نزیکییانەوە لەیەک و نەبوونی بەربەستە لەنێوان نەوەکان و باوانیان.

کەسی وا هەیە بە باوکی دەڵێت "تۆ"، بەڵام لەهەمان دانیشتن بە هاوڕێکەی باوکی دەڵێت "بەڕێز".. ئەمە واتای ئەوە نییە کە ڕێزی هاوڕێکەی باوکی زیاتر یان کەمتر دەگرێت لە هی باوکی، بەڵکو ئەوە ڕۆشنبیری میسرییە.

بۆ نموونە ڕەنگە تێبنی ئەوەت کردبێ کاتێک گەنجێک لە پەروەردەیەکی ڕۆژئاوایی گەورە بووبێت، هەر بۆیە بە کەسی لەخۆی گەورەتر دەڵێت "تۆ" ، ئاساییە ئەگەر کۆمەڵگە سەری سوڕبمێنێ لە ڕەفتاری ئەم گەنجە کە ڕێزی لەخۆی گەورەتر

ناگرێت، ڕەنگە هەندێک پێی بڵێن بێ ئەدەب، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت " باشە خۆ تەنانەت پێغەمبەرەکانیش کەس پێی نە وتوون "بەڕێز"!

ئامۆژگاری: هیچ پێویست ناکات بەهۆی ئەم ڕۆشنبیرییەوە تووشی هەڵچوون بیت، ئەگەر چی حەق بەتۆیە کە بەڵگە نییە لەسەر ڕێزگرتن، بەڵام گەر بینیت کۆمەڵێ خەڵک لەسەر ڕۆشنبیرییەک کۆکبوون، هیچ پێویست ناکات بیگۆڕیت، یان پشت گوێی بخەیت، لەکاتێدا هیچ زیانی نە بۆ تۆ نە بۆ هیچ کەس نییە.

***

# وێستگەی حەوتەم

## قسەكردن بریتییە لە زانیاری وەرگرتن و بەخشین

گفتوگۆ چەند جۆرێكی هەیە:

-گفتوگۆ هەیە وەكو یاری تێنسی سەرمێز( ping pong ) وایە، هەردوولا هەڵدەستن بە وەڵامدانەوەی یەكتر بە شێوەیەكی خێراو بەهێز، ئەم قسەیەك دەڵێ، ئەویتر قسەیەك دەكات تاوەكو كۆتایی گفتوگۆكە، ئەمەش دەكرێ لەكاتی وتوێژ یان مشتومڕ بەم شێوەیە بێت.

-گفتوگۆی تر هەیە كەمێك نەرم و نیانترە، وەكو یاری تێنس وایە هەریكە و كاتی خۆیان دەبەن بۆ ئەوەی تۆپەكە بهاوێژنە لایەكی دیكەی یاریگاكە، ئەمەش گفتوگۆیەكی پەسەند و جوانە. هەریەك لە گفتوگۆكاران كاتێكی كەمییان هەیە بەڵام بەسە بۆ ئەوەی مەبەستی خۆیان بگەیەنن، جیاوازی نێوان گفتوگۆی تێنسی و گفتوگۆی تێنسی سەرمێز( ping pong ) بریتییە لە خێرای وەڵامدانەوە و كەمی ماوەی بەردەست بۆ هەردوولا.

-جۆرێكی دیكەی گفتوگۆ هەیە، ئەویش گفتوگۆی (گۆڵفە).. ! ئایا دەزانی یاری گۆڵف چییە؟.. ئەوەیە تۆپەكە بە هۆی لێدەرێكەوە دەهاوێژرێت بۆ شوێنێكی دوور پاشان بەهێواشی

دەچێت تاوەکو دووبارە بیهاوێژێت و بکەوێتە کونەکەوە، کەسی بەرامبەر بەهەمان شێوەیە لەکاتی گفتوگۆکردن. تۆپێکی تایبەت بەخۆی هەیە و لە سەرەی خۆیدا دەیهاوێژێت پاشان بە لەسەرخۆی دەچێت بۆلای تۆپەکە... ئەم جۆرە گفتوگۆیە زۆربەی کات بۆ چارەسەرکردنە لە کۆبوونەوە ڕەسمییەکان و لێکۆڵینەوە گشتییەکاندا، بەجۆرێک هەردوولا دەرفەتیان پێ دەدرێت پرۆگرام و بیر و بۆچون و وتەکانیان بخەنەڕوو، بەڵام ڕاستەوخۆ وەڵامی یەکتر نادەنەوە.

-جۆرێکی تریان بریتییە لە گفتوگۆی تۆپی سەبەتە، هەرلایەک دەیەوێت خۆی تۆپەکە بەدەست بێنێت نەوەک لایەنەکانی دیکە و پاشان گۆڵ تۆمار بکات، تەنانەت دوای گۆڵ تۆمارکردنیش دووبارە تۆپەکەی دەستدەکەوێ و بەهیچ شێوەیەک ئامادە نییە دەستبەرداری بێت.. ئەمەش گفتوگۆیەکی شکۆدارانە نییە، ئەم جۆرە گفتوگۆیە زۆربەی کات لەنێوان خەڵکی ئاساییدا ڕوودەدات لەکاتی ئاژاوە و دەمەقاڵێ. کێشەکە ئەوەیە زۆربەمان گفتوگۆی تۆپی سەبەتە؟بەکاردەهێنین، لەکاتێکدا پێویستە گفتوگۆی تێنسی سەرمێز بەکاربێت، یان ڕەنگە گفتوگۆی گۆلفمان بەکارهێنابێ، بەڵام باروودۆخەکە پێویستی بەگفتوگۆی تێنس هەبووبێت... هەرکەسێک هەڵە بکات لەهەڵبژاردنی گفتوگۆیی

گونجاو بۆ بارودۆخی دیاریکراو زۆربەی کات ئەنجامی ئەرێنی دەستناکەوێ و زیانەکەی زۆر زیاتر دەبێت لە سوودەکەی.

ئامۆژگاری: هەوڵبدە بۆ هەڵبژاردنی شێوازی گونجاو، تاوەکو زۆرترین سوودت دەستکەوێ لە گفتوگۆکە.

# كـۆتا وتـه

<u>كۆمەڵە وشەیەک شایەنی تێڕامانن لەم کتێبەدا:</u>

لەزۆربەی ئەم خوولە پەروەردەیی و وانانەیی تێیدا بەشدار دەبم، هەڵدەستم بە ئامۆژگاری کردنی ڕاهێنەران و ئامادەبووان کە ئەم وشەیەی زۆر سەرەنجی ڕاکێشاون و پێیان گرنگ بووە لەسەر وەرەقەیەک بینووسن بە هەرشێوە و زمانێک بێت، گرنگ ئەوەیە بینووسن و سەیری بکەن بۆ ئەوەی باش بیریان بێتەوە.

ئەم کارە سوودی زۆرە، لەوانە پێداچوونەوەی بابەتەکە بەگشتی و، جێگیرکردنی واتا سەرەکییەکان کە سەرەنجی ئامادەبووانی ڕاکێشاوە، هەروەها پوختەیەکە لەسەر هەموو ئەو شتانەی باسکراوە یان ڕەنگە ڕاهێنەرەکە پرسیارێکی بۆ دروستبێت، پاشان دواتر لەبارەیەوە دەپرسێت یان گفتوگۆیی لەبارەوە دەکات لەگەڵ هاوڕێ و خزمەکانی..

هیوادارم خوێنەری هاوڕێم ڕێگەم بدەی لەجێگەی تۆ وشە و ڕستە گرنگەکان بنووسم کە لەم کتێبەدا هەیە... لەوانە:

١) بەم شێوەیە .. ئەوپەڕی لای ڕاست و چەپ، تاوەکو وای لێ دێت هیوا و تێگەشتن لەناودەچێت.

٢) ئەوەی دەتەوێ بەکوورتی بیڵێ.

٣ ) پرسیاری ڕاست و گونجاو نیوەی وەڵامە.

٤ ) بەڵام ئێمە لەبنەڕەتدا فێرنەبووین چۆن پرسیار بكەین، كوا لەكوێیە ئەم زانستە لە خوێندنگە و زانكۆ و كۆمەڵگاكەماندا... كوا هونەری پرسیاركردن؟ كوا هونەری ئاخاوتن؟

٥ ) گێلێكی بێدەنگ بە دانا دادەنرێت.

٦ ) هەڵگری دروشمی " من قسە دەكەم" بێت " كەواتە من بوونم هەیە".. كێشەكە ئەوەیە نازانێ ئەم درووشمە ڕەنگە تێڕوانینی خەڵكی بۆیی بریتی بێت لە : ئەو زۆر قسە دەكات، كەواتە من لێرە نابم.

٧ ) دوو جۆر بێدەنگی هەن (بێدەنگی ئەرێنی و بێدەنگی نەرێنی)

٨ ) كاتێك ئامۆژگاری كەسێك دەكەیت ئەوەندە درێژە بەقسەكانت مەدە كە تەنانەت كەسی بەرامبەر سەری لێ بشێوێت و ئەوەی باستكردووە لەبیری نەمێنێت.

٩ ) باسی هەر شتێك بكرێ دەبینین هاوڕێكەمان دەڵێت: "بەسەر منیشدا ڕویداوە".

١٠ )بەم شێوەیە، بەهۆی بەپەرۆشبوونییەوە و قسەكەر دەبڕێ و هەلی ناداتێ تاوەكو ڕوونكردنەوە بدات، ئاواش هەم كات و ئاخاوتن و مەبەستی گفتوگۆكردن لەناو دەبات بەگشتی.

١١ ) زۆربەی خەڵكی لەكۆمەڵگەی عەرەبیدا جیاوازی لە نێوان وتووێژ و مشتومڕناكەن.

١٢) بێگومان دەنگ بەرزی هێمایەکی دیار و باشە بۆ جیاکردنەوە وتووێژ لە مشتومڕ.

١٣) قسە پێ بڕین، زۆربەی کات بەقازانجی خاوەنەکەیدا ناشکێتەوە، بۆیە پێشنیار ناکرێ تەنها لە باردۆخێکی زۆر ئەستەمدا نەبێت.

١٤) ڕەخنە لە قسەکان بگرە، بەڵام لەکەسەکان نا.. کردارەکە سەرزەنشت بکە، بەڵام بکەرەکەی نا.. تکایە، لە بکەرەکەی بگەڕێ.

١٥) نەبوونی قسەی خۆش لەنێو ئەندامانی خێزان و کەسە نزیکەکان بەرهەمەکەی بریتییە لە شتێک کە پێی دەوترێت بێ سەلیقەیی.

هاوڕێکەمان خوێنەری ئەم کتێبە

پێش ئەوەی کتێبەکە دابخەین با لەسەر کۆمەڵە شتێک ڕێککەوین، دڵنیاین بە دڵت دەبێت.. با کۆک بین لەسەر ئەوەی خوێندنەوە مرواریيەکە خوای گەورە بەفەزڵی خۆیی پێی بەخشیوین، ئەو چێژە تایبەتە- کە بەهەندێ کەسی نەبەخشیوە- ئەویش چێژ و تام وەرگرتنە لە خوێندنەوە.. ئێمە دەخوێنینەوە و فێردەبین، دەخوێنینەوە باسەکەی بۆ ئەوانی دیکە دەگێڕینەوە، دەخوێنینەوە و باسی جیهان لە چەند پەڕەیەکدا کوورت دەکەینەوە، دەخوێنینەوە ڕێکدەکەوین، دەخوێنینەوە و جیاواز دەبین، دەخوێنینەوە و دەخوێنینەوە و دەخوێنینەوە. بەڵام بەدڵنیاییەوە، ئێمە دەخوێنینەوە و چێژ وەردەگرین..

کەواتە....

مەهێڵە ئەو چێژە لای تۆ بوستێ، مەهێڵە ئەم کتێبە تەنها لەدەستەکانی تۆدا بمێنێتەوە - دوای ئەوەی تەواو دەبێت - چەندەها کەس هەن نەیان خوێندۆتەوە، یان پارەیان نییە تا بەدەستی بهێنن، یان هیچیان لەبارەی ئەم کتێبەوە نەبیستووە.. ئاگەدارییان بکەوە لەبارەی ئەو تام و چێژە خۆشە، ئەو خۆشییە دەگمەنەی هەمووان لەبارەیەوە نازانن.

کتێبەکەت ببەخشە بە ئەندامانی خێزانەکەت یان هاوڕێکانت، هاوسێکەت، هاوکارەکەت، یان تەنانەت هەر کەسێک کە لە شوێنە گشتییەکان کە پێشتر نەت بینیوە! ببە بە وەسیلەیەک بۆ خۆشبەختکردنی ئەوانی تر بەم کتێبە، سەرسام مەبە ئەگەر ڕۆژێک کتێبێکت بەدەست بگات کە پێشتر نەت خوێندبێتەوە و کەسەکە باسی خۆشی و چێژی کتێبەکەت بۆ بکات پاش ماوەیەکی تر.

توانای گەیاندنی بیروبۆچوون و هەستەکانت بە خەڵکی گرنگترین هۆکارە بۆ سەرکەوتنت. زۆرن ئەوانەی ڕێگەی سەرکەوتنیان بڕیوە و دانیان بەوەداناوە کە لێهاتوویان لەهونەری ئاخاوتن هۆکاری سەرەکی بووە بۆ ئەو تایبەتمەندیی و سەرکەوتنەیان.

تواناکانی پەیوەندیکردن communication skills توانایەک نین کە بەبێ بونیان بتوانی ژیان بەسەر بەریت، بەڵکو زۆربەی کات هاوبەشی سەرکەوتنەکانە.

ئەم کتێبە لەباسی ئەو لێهاتوویانەوە دەدوێت بەشێوەیەکی جیاواز، بەجۆرێک بگونجێت لەگەڵ ئەو واقعەی تێیدا دەژین و لەگەڵ خەڵکی مامەڵە دەکەین. لەم کتێبە تێبینی خۆت دەکەیت کاتێک قسە دەکەیت و گوێ دەگریت، بەهەمان شێوە خزم و

هاوڕێ و هاوکارەکانت دەبینی کاتێک قسە دەکەن و گوێ دەگرن... دوای یەک جار خوێندنەوەی ئەم کتێبە ساکارە زۆر ڕاستی سەرسوڕهێنەرت بۆ بەدیار دەکەوێت لەبارەی ئەم هونەرە نایابەوە، ڕەنگە لەمە بەدوا چاو بگێڕیتەوە بە شێوازی پەیوەندیکردنت لەگەڵ کەسانی دەوروبەرت، گومانت نامێنی کەوا تەنها شتێک پێویستبێ لەژیانی کەسی و پیشەیدا گرنگی پێبدرێت بریتییە لە بەدەستهێنانی کارامەیی تەواو لە هونەری ئاخاوتندا.

# ناساندنی نووسەر

یەکێکە لە هەوادارانی گەشەپێدانی توانای بەڕێوەبردنی لاوانی میسرە، پێشینە ئەکادیمییەکەی تەنها هۆکار نەبووە بۆ گرنگیدان بە زانستی بەڕێوەبردن، بێجگە لەوەی بەکالورێوسی هێناوە لە بواری بەڕێوەبردنی کار لە زانکۆی عین الشمس، و ئاستی ماستەر لە بەڕێوەبردنی کار لە ئەکادیمیایی عەرەبی زانستی تەکنەلۆجیا، هەروەها بەدەستهێنانی ئاستی دکتۆرا لە هونەری کڕین و فرۆشتن لە زانکۆی ئەمریکی لە لەندەن، لەگەڵ هەموو ئەمانە شارەزای زۆری هەیە لە گرتنە ئەستۆی بەرپرسیارێتییە گرنگەکان لە گەورەترین کۆمپانیاکانی جیهان کە نەتەوایەتی جیاوازی تێدایە... هەروەها ڕۆڵی کاریگەری هەبووە لە ڕاوێژکاری بەڕێوبەرایەتی، ڕاهێنان، وە لێدوانە گشتییەکان.

ئیهاب فکری لەدایکبووی ساڵی ١٩٧١ ە، و لە قاهیرە نیشتەجێیە لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی.

# ناوەڕۆک


| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|
| ٧ | پێشەكی |
| ١٠ | سوودی هونەری ئاخاوتن چییە؟ |
| ١٣ | ئاخۆ ڤۆمیتینگی هەیە؟ |
| ١٥ | خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوە !! |
| ٢١ | هونەری گوێگرتن |
| ٢٥ | ئەی پیاو قسە بكە تاوەكو شارەزاتبم چۆن بتناسم له كاتێكدا ئەوەی لە ناختدایە دەری ناخەیت |
| ٣٢ | لە یۆنان |
| ٣٤ | ئەی هاوار |
| ٤١ | پێڵاوی پاژنە بەرزی چی كوڕی ... |
| ٤٨ | قسە پێبڕین |
| ٥٠ | جۆری یەكەم قسە بڕین بەهۆی بایەخ نەدان بە قسەكەر و ئەو بابەتەی باسی دەكات |
| ٥٦ | جۆرری دووەم بیردۆزی هەروەها منیش |
| ٦١ | جۆری سێیەم قسە پێ بڕین بە مەبەستی بەرهەڵستی |
| ٦٧ | جۆری چوارەم قسە پێ بڕین بۆ پیشاندانی ڕەزامەندی |

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| جۆری پێنجەم<br>قسە پێ بڕین بە ئامانجی گاڵتە پێکردن | ٧١ |
| جیاوازی نێوان مشتومڕ لەگەڵ وتووێژ | ٧٥ |
| ڕەخنەگرتن لەکەسی قسەکەر | ٨٦ |
| ڕەخنەی بابەتییانە ( الموضوعی) | ٩٠ |
| ڕەخنەی نابابەتییانە ( النقد غیر الموضوعی) | ٩٠ |
| پوختەی جیاوازی نێوان وتووێژ و مشتومڕ | ٩٤ |
| بازنەی کەسی | ٩٦ |
| کورم ئەوە برامە | ١٠٠ |
| سەیری ئەو نارەسەنە بکە... | ١٠٢ |
| پوختەی بازنەی کەسی | ١٠٤ |
| هونەری ئاخاوتن<br>پوختە | ١٠٥ |
| حەوت وێستگەکە | ١٠٧ |
| وێستگەی یەکەم<br>پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان | ١٠٨ |
| وێستگەی دووەم<br>سەرزەنشتکردن | ١١٤ |
| وێستگەی سێیەم<br>لە پاشملە باسکردن ( غەیبەت) | ١١٥ |
| وێستگەی چوارەم<br>گشتاندن | ١١٧ |
| وێستگەی پێنجەم | ١١٩ |

| | |
|---|---|
| پێویستییەکان | |
| وێستگەی شەشەم<br>بەڕێز.. | ١٢١ |
| وێستگەی حەوتەم<br>قسەکردن بریتییە لە زانیاری وەرگرتن و بەخشین | ١٢٣ |
| کۆتا وتە | ١٢٦ |
| ناساندنی نووسەر | ١٣٢ |
| ناوەڕۆک | ١٣٣ |



ئەتەکێتی قسەکردن.

لە بری ئەوەی بە خوشکەکەت بڵێ ئادەی پەرداخێک ئاوم بۆ بێنە، دەتوانی بڵێی خوشکی خۆم بە ئاوی دەستی تۆ تینوێتیم دەشکێ.

لە بری ئەوەی بە کەسێک بڵێی وەرە لەگەڵم، دەتوانی بڵێی یاوەری تۆ ماندوێتی ڕێگام لە بیر دەباتەوە.

لە بری ئەوەی بە دایکت بڵێی برسیمە نان دەخۆم دەتوانی بڵێی دایکە من نەک هەر گەدەم دڵیشم داوای خواردنەکانی دەستی تۆ دەکات.

لە بری ئەوەی بڵێی خۆشم دەوێی، دەتوانی بڵێی هەرچی خۆشییە بۆ تۆم دەوێ و خەمەکانت بۆ خۆم.

لە بری ئەوەی بڵێی بۆ تۆ دەمرم، دەتوانی بڵێی بۆیە حەز ناکەم بمرم چونکە تۆ هەیت.

لە بری ئەوەی بڵێی ناتوانم، دەتوانی بڵێی ڕێگاکەم سەختە بەڵام کۆڵ نادەم.

لە بری ئەوەی بڵێی دۆڕام، دەتوانی بڵێی ڕێگایەکی تر دەدۆزمەوە بۆ سەرکەوتن.

لە بری ئەوەی بە کەسێک بڵێی ئەو ئیشەم بۆ بکە، پێی بڵێ بەیارمەتیت ئەو ئیشە چۆن دەکرێت.







هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری - تەنیشت پاڕێزگا
0750 406 66 74
RAHA / ڕەها